# پەیامی ڕاستی



وەرزە گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی گشتییە

96

بیلال باسام:



وەرگێران پێویستی بە

موحارەسە و حەشق و

دۆزینەوەی هاوواتایە

لەم ژمارەیەدا

* یەکەم دابەشکردنی کوردستان
* عیشق، ڕۆحی دین و دەسکەلای ژینە
* دەستەی گشتیی دەستپاکی و دەسەڵاتەکانی
* ڕۆڵی پاراستنی بەکاربەر لە بازاڕەکانی هەرێمدا



فائیزە عەلی:

سپێدە ماڵی دووەمە



د. عوسمان هەڵەبجەیی:

خەڵك ئێستا بەدووی دالی دکتۆراوەیە

نەك عەودالی زانست و مەعریفەت




# ژمارە 96

## لەم ژمارەیەدا

# پێڕست




خاوەنی ئیمتیاز

محەممەد فەرەج ئەحمەد

سەرنووسەر

عەلی صالح میـران

alisalhmiran@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین

زیاد رەشاد قادر

Zirak1974@yahoo.com

دیـزاین و کاری هونەری

محەممەد عەلی میران

پەیامی ڕاستی

ناونیشان/هەولێر- گەڕەکی تەیراوە ـــ تەنیشت گۆڤاری لەکەرگوشەکان.

ژمارە (96)، 2013

(پەیامی ڕاستی) وەرزەگۆڤارێکی رۆشنبیریی گشتییە، یەکەم ژمارەی لە شوباتی 1992 دەرچووە، ژمارەی متمانەی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان: (104)

# یەکەم دابەشکردنی کوردستان هەرێمیی بوو، نەك مەزهەبیی



سەلام ناوخۆش

## دەروازە

هۆی سەرەکی لە هەڵبژاردنی ئەو بابەتە دەگەڕێتەوە بۆ قسەی ئەو سیکیولەرە کوردانەی، کە ڕایەکانیان وا ئێمەی کورد ئازار دەدەن کە وەك ئازاری گەستنی مێشوولەیەکە، چونکە لە سەر هیچ بنەما و شەنگستێکی مێژوویی دانەمەزراون. لە زۆربەی سەرچاوەکانیان ئاماژە بەوە دەکرێ کە یەکەم دابەشکردنی کوردستان بە هۆی هەژموونی شیعە لە دەڤەرەکە بووە، بۆیە کورد بووەتە بەشێك لە لەشکری سوننەی عوسمانی! لەم نووسینەدا ئیسپات دەکەین بە پاڵپشتی سەرچاوە کە شەڕی چاڵدێران 1514 لە ئەنجامی هەژموونی شیعەی صەفەوی دروست بووە. ئەو لێك جیابوونەوەی ئاقاری شیعە و سوننە دوای دابەشکردنی ساسانی و ئەوروپایی بووە.

لە ژێدەرە سیکیولاریەکاندا بە دەگمەن ئاماژە بە یەکەم دابەشکردنی کوردستان دەکرێت. یەکەم دابەشکردنی کوردستان لە زاکیرەی زۆربەی خوێنەری کورد لە ئەنجامی ململانێی مەزهەبی لە پاش شەڕی چاڵدێران دروست بووە؟

ئەم نووسینە هەوڵ دەدات ئەمە لە هاردی تاکی کورد بسڕێتەوە و مەسەلەی یەکەم دابەشکردنی کوردستان زۆر لەو مێژووە دوورتر بکاتەوە.

## دەوڵەتی میدی 729-549 پ.ز و نەمانی دەوڵەتی ئاشوری

دەوڵەتی میدی سەرەتای دەوڵەتی دیموکراتی کوردییە. هەرچەندە ئەو دەوڵەتە دەوڵەتێکی بنەماڵەیی بوو، بەڵام لە هەموو دەوڵەتەکانی دەڤەر دیموکراتیتر بوو. ئەو سیمایە نووسەرێکی بیانی ناچار کردووە ناوی کتێبەکەی خۆی بنێ: "دیموکراسیەت لە میدیاوە بۆ ئەمەریکا" هەروەها دیاکۆنۆڤ نووسەری میدیا دان بەوەدا دەنێت "کە ئەدگاری دیموکراسیەت لە مەملەکەتی میدیا بوونی هەبووە." کەچی دەوڵەتێکی وەك دەوڵەتی ئاشووری لە سەر فراوانخوازی و داگیرکردن و هەڵمەتی سەربازی درێژەیان بە بوونی خۆیان داوە، ئەوە وای کردووە دەوڵەتی میدیا و دەوڵەتی کلدانی هاوپەیمانییەك بکەن بۆ ڕوخاندنی دەوڵەتی ئاشووری لە نەینەوا لە 612 ی بەر لە زایین.

دیاکۆ دامەزرێنەری دەوڵەتی میدی بووە و ئەستیاگ دوا پاشای ئەو دەسەڵاتە بووە. دەسەڵاتی ئەستیاگ هێندە لە لای ناسیۆنالیزمی فارسی

## پێش دەوڵەتی میدی و هەرەسی دەوڵەتی میدی. مێژووی کوردی لە پرۆسەی نووسیندا وەك تاکێکی کوردی ون بووە یان ون کراوە. ئەوەش واتای ئەوە دەدات. کە کورد پێش دەوڵەتی میدی یەکگرتوو نەبووە و تەنیا لە حکومەت و هێزی ناوچەیی گرد بووەتەوە

ناشیرین کراوە هەتا بووەتە ناوێکی تر بۆ زوحاك، هەروەها هەرەسی ئەو دەسەڵاتە لای عەوامی کورد وەك ناسیۆنالیزمی فارسی جەژن بێت. بە هەرەسی دەسەڵاتی ئەستیاگ، دەسەڵاتی فارسی بەناوی ئەخمینییەکان، ئەشکانییەکان، ساسانییەکان دروست ببێت.

ئەو کودەتایەی کۆرشی کچەزای ئەستیاگ لە سەر ئەستیاگی باپیری لە ڕێگای دایکەوە کردی, کۆتایی بە دەسەڵاتی کورد هێنا هەروەها کۆتایی بە بەشداری کورد هێنا لە شارستانی دێرین!

## مێژووی دێرینی کورد لە مێژووی نەتەوەکانی تر

پاش ئەو هەرەسەی ئەستیاگ، هەتا دەرکەوتنی ئیسلام لە ناوچەکەدا ناسنامەی قەومی کورد ون بوو، بە واتای لە ساڵی 548ی بەر لە وەلادەتبوونی عیسا هەتا 642 میلادی (548+642 =1190 ساڵ)، ناسنامە و دەوری کورد لە شارستانی گەلانی ئێرانی ون بوو، یان ون کرا لە مێژوو و کولتووری فارس!

پێش دەوڵەتی میدی و هەرەسی دەوڵەتی میدی، مێژووی کوردی لە پرۆسەی نووسیندا وەك تاکێکی کوردی ون بووە یان ون کراوە. ئەوەش واتای ئەوە دەدات، کە کورد پێش دەوڵەتی میدی یەکگرتوو نەبووە و تەنیا لە حکومەت و هێزی ناوچەیی گرد بووەتەوە. ئەو حاڵەتە وای کردووە نەتەوەیەك بێت دوور بێت لەوەی کەسانی وەك ئەریستۆ تالیس و هیرۆدۆتس و سوقراتی... تێدا هەڵکەوێت. جگە لە سروشتی کوردستان، مێژووی دێرینی کورد لە تابلۆکانی سۆمەری (هەرچەندە مەسعوود سەعیدی نووسەری کتێبی - السومریون تری من یکونون ان لم یکونو کوردا - کوردێتی سۆمەرییەکان باس دەکات) و ئاشووری و کلدانی بە

دەست دەکەون. زمانی ئەو دەقانەش لە زنجیرەی زمانی مردووی یۆنسکۆن ئەوانەی بە دروستی ئەو زمانانە دەزانن بە ژمارە زۆر کەمن!!

## ساسانی کورد بوونە یان فارس؟؟

ناسیۆنالیستی کوردی لە سەر دوو پایە ساسانی بە کورد دادەنێن:

1-قسەی تەبەری، قسەی تەبەری کە دەنووسێت: "کە ئەردەوان بە ئەردەشێر دەڵێ ئەی کوردی گەورە بووی ژێر ڕەشماڵی کورد، چۆن دەوێری بێ فەرمانی من تاج لە سەر نێی.... بەرگی دوو، ل7." ئەو قسەیەی تەبەری مەرج نییە ڕاست بێ هەروەها ئەمە جوێنە، ئێستاش هەندێ نەتەوە بە کورد دەڵێن: "هەی کرمانج.... لە کرمانجێتی خۆی ناکەوێ، وێڕای ئەوەش وشەی خێمە - خێوەت مەدلوولی ئەوە بە دەستەوە دەدات، کە کورد لە سەردەمی ساسانیدا دوور بووە لە شارستانیەت و نەتەوەیەکی دەوارنشین بووە، نەك شارنشین..

## ڕقلێبوونەوە لە ئیسلام

نەوەی نوێ وا گۆش بکرێت، کە لەشکری ئیسلام ئەمپراتۆرییەکی کوردی ڕووخاندووە، بەوەش ڕقیان زیاتر لە ئیسلام ببێتەوە.

لە ڕاستیدا پاش ڕووخانی حکومەتی ئەستیاگی دوا پاشای میدیا, کورد هەتا هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان کە دەکا نزیکەی 13 سەدە دەسەلاتی خۆی نەبووە. هەروەها فارسەکان لە سەردەمی ساسانییەکان ماوەیەك پەهلەویان کردووەتە زمانی دەوڵەت، بەڵام لە بەر دژواری پەهلەوی زمانی فارسییان کردووەتە زمانی دەوڵەت. جا ئەگەر ساسانی دەوڵەتی کوردی بێت:

1-دەوڵەتێکی ستەمکار بووە: موعاریزەکانی خۆی مەسیحیە کوردەکان، مەزدەکەکان، مانییەکانی هەموو لە ناوبردن یان چەوساندنەوە.

2-چۆن دەوڵەتی کوردی زمانی فارسی دەکاتە زمانی دەوڵەت؟؟

3-چۆن بەشێکی خاکی کورد لە ژێر دەستی ڕۆمەکان دەبێت؟؟

4- قسە لە سەر ئەوە دەکرێ کە لە ئەنجامی شەڕی مەزهەبی شیعە و سوننەی ئیسلامەوە، کوردستانی گەورە بووەتە دوو بەش، کوردستانی عوسمانلی و کوردستانی صەفەوی؟ ئەوی ڕاستی بێت کوردستان لە سەردەمی دەسەلاتی ساسانی و ڕۆمی کراوەتە دوو بەش، نەك لە سەردەمی شەڕی چالدێران 1514-1516. لەو نێوەش بەدلیسی تاوانبار دەکرێ کە کوردستانی عوسمانلی خستووەتە ژێر دەستی عوسمانلی، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت بەدلیسی دەسەلاتی میرە پەرتەوازەکانی کردووەتە یەك، هەروەها ئەو بەشەی لە هەرەشەی صەفەوییەکان ڕزگار کردووە، هەروەها سیستەمی فیدراڵی بۆ کورد فەراهەم کردووە.

## یەکەم دابەشکردنی کوردستان؟

بەر لەوەی لەشکری ئیسلام کۆتایی بە دوو هێزی ڕکابەری ساسانی و ڕۆمانی بێنێت، کورد و نەتەوەی دی لە بەرداشی ئەو دوو هێزە ڕزگار بکات، ئاماژە بە یەکەم دابەشکردنی کوردستان دەکەین.

## دەسەلاتی فارسی و کورد

ئەو کوردانەی لە دوای هەرەسی ئەستیاگ -548 پ. ز کەوتنە ژێر حوکمی فارسی، ئەو ئەدگارانەیان هەبوو:

*زۆربە زەردەشتی بوون، کەمێك مەسیحی بوون.

*ڕۆژهەلاتی کوردستان و بەشێك لە باشوور و باکووری کوردستان لە ژێر دەستی فارسی بوو.

*هەندێك پەیرەوی ماجییەکانی زەردەشتیان دەکرد, کە لە ئەدەبیاتی کوردی بە مەجووسی ناسراون.

*چونکە ساسانییەکان 226-651 زایینی تاکڕەو بوون لە حوکمکردندا، هەردوو بزوتنەوەی مانی و مەزدەکی یان لەنێو برد. ئەو دوو بزوتنەوەیە تەواو دژ بە یەك بوون.

*زۆربەی شەڕی لەشکری ئیسلام لەگەڵ دەسەلاتی فارسی بووە، کە بە ڕواڵەت پەیڕەوی ئافێستای دەسکردیان دەکرد، چونکە ئافێستای زەردەشتی ئەسکەندەری مەکدۆنی بە قسەی سۆزانییەك سوتاندی!

ئەو دەڤەرە بە هەرێمی چیا ناسرا بوو. شارە ناودارەکانی بریتین لە نەهاوەند، ئەکباتان-هەمەدان، کەرمەشان....

**بە پێچەوانەی ئەوەی دەگوترێ، کە کوردستان لە ئەنجامی شەڕی مەزهەبی نێوان لەشکری عوسمانی و لەشکری صەفەوی لە 1516 یەکەم جار دابەش کرابێت، هیچ بنەمایەکی ئەکادیمی نییە**

## بەشەکەی تر لە ژێر دەستی ڕۆمەکان بوو

ڕۆمەکان بابەگەورەی ئەورووپاییەکانی ئەمڕۆن. ئەوان بەشێکی کوردستانیان بۆ خۆیان دابڕی بوو. کوردەکانی بەر حوکمی ڕۆمەکان ئەو خەسڵەتەیان هەبوو:

*بە پێچەوانەی بەشی بندەستی ساسانیەکان، زۆربە مەسیحی بوون، ژمارەیەکی کەم زەردەشتی بوون. د.ڕەشاد میران لە ڕەوشی ئایینی...دەنووسێت: "کورد لە گوندی چەرمۆ بتپەرست بوون...." ئەوە دەسلمێنێت کە کوردستانی کۆن لانکی فرە ئایینی جیابووە. ئەو کوردانەی ئەوێ پاش ئەوەی خەڵکی ئەوێ موسڵمان بوون، هەندێ لە سەر مەسیحیەت ماونەتەوە، نەك نەتەوەی جیاواز بن یان ئیمتیدادی ئاشووری بن، چونکە لە هاوپەیمانی میدی و کلدانی هاتووە، کە لە پاش لە نێوبردنی نەینەوای پایتەختی ئاشووری، ئاشووری جارێکی تر لە مێژووی کۆن دەرنەکەوتنەوە!

*بەشێکی زۆری باکوور و ڕۆژئاوای کوردستان و بەشێکی بچووکی باشووری کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی عەسکەری ڕۆمەکاندا بوون.

*مەسیحییەکانی هەردوو بەش دەچەوسێنرانەوە: شاپووری دووەم بۆ ماوەی 40 ساڵ، کە ناسراوە بە چل ساڵی چەوساندنەوەی مەسیحییەکان، تا مردنی خەریکی چەوساندنەوەی مەسیحییەکان بوو، چەندین کوردی مەسیحی بوونە قوربانی سیاسەتەکانی زەردەشتی. ڕۆمەکانیش درێغیان نەکرد لە چەوساندنەوەی کوردە مەسیحییەکان!

*بە پێچەوانەی کوردەکانی ناو دەوڵەتی ساسانی، کوردەکانی ژێر دەستی ڕۆمەکان یان بە ئاشتی موسڵمان بوون، یان جزیەیان دا لە سەر مەسیحیەت مانەوە!

*کوردەکانی ژێر دەستی ڕۆمەکان بە کوردەکانی هەرێمی جزیرە ناسرا بوون. لە شارە ناسراوەکانی بریتی بوون لە جزیرە، ئامەد — دیاربەکر، ماردین، ژەنگار، هەولێر....

## ئەنجام

بە پێچەوانەی ئەوەی دەگوترێ، کە کوردستان لە ئەنجامی شەڕی مەزهەبی نێوان لەشکری عوسمانی و لەشکری صەفەوی لە 1516 یەکەم جار دابەش کرابێت، هیچ بنەمایەکی ئەکادیمی نییە. ڕاستییەکەی کوردستان لە نێوان فارسە زەردەشتییەکان و ڕۆمە —ئەورووپاییەکان چەندین ساڵ پێش پەیدابوونی موسڵمانەکان، یەکەم جار دابەش کرا بوو! ئەو ناوچەیەی لە ژێر دەسەڵاتی فارسدا بوو، ناسرا بوو بە ئەقلیم جیبال، کە لە شارە ناسراوەکانی بریتی بوون لە "هەمەدان، نەهاوەند، قرماسین—کەرمەنشا، حەلوان، شاپور خواست، کنکور، دینەوەر، سیروان" هەروەها شارە ناسراوەکانی ژێر دەستی ڕۆمەکان بریتی بوون لە "ئامەد —دیاربەکر، نصیبین، دارا، ماردین، سنجار، هەولێر—حەدیاب...." (وەرگیراو لە لاپەڕە 21 هەتا 34 کردستان فی عهد الساسانیین).

خاڵێکی دی هەرەسی میدیا بە دەست فارسەکان لە 548ی بەر لە زایین وای لە کورد کردووە هەتا ئێستاش جارێکی تر دەوڵەتی سەربەخۆی نەبووەتەوە لە هەموو خاکی کوردستان. ئەویش زەنم وایە هۆیەکەی ئەوەیە، کە ناسیۆنالیستی کوردی دەمێك خەریکی ناسیۆنالیستی کوردی، مارکسی بووە، ئێستاش خەریکی زیندووکردنەوەی ئەفسانەن، دەیانەوێت ئەفسانە بەدیلی ئیسلام بێت!







# د. عوسمان هەڵەبجەیی:

# خەڵک ئێستا بەدووی داڵی دکتۆراوەیە نەک عەوداڵی زانست و مەعریفەت

دیمانە: محەممەد عەلی میران

**پەیامی ڕاستی: گەشتی ژیانی تایبەتی خۆت و گەشتی بەردەوامت بۆ وەدەستهێنانی زانست و زانیاری چۆن بوو؟**

دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی: ئەگەر مەبەستتان خوێندنی زانستە شەرعییەکان بێت کە بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی ئیجازەی زانستی لە خزمەت مامۆستا ئایینییە بەڕێزەکاندا دەخوێندرێت، ئەوە دەستپێکی دەگەڕێتەوە بۆ خوێندنی قورئان و تەجوید و هەندێك بابەتی هزری لە مزگەوتی بیلال و ئوسامە لە شاری هەڵەبجەی خۆشەویست، لە خزمەت چەند مامۆستایەکی بەڕێزدا، وەك: مامۆستا بورهان و مامۆستا نامق و مامۆستا ئەمیری شەهید و لە پاشان چەند وانەیەك لە عەوامیلی جورجانی لە خزمەت مامۆستا شێخ عومەر لە مزگەوتی داروسسەلام لە هەڵەبجە. دواتر کتێبی (مغني الطلاب) کە بە ئیساغۆجی ناسراوە و لە بنەماکانی زانستی لۆژیك دەدوێت لە خزمەت مامۆستای زانا و گەورەمان مامۆستا شێخ نورەددین -خوای گەورە بە فیردەوسی باڵا شادی بکات- لە مزگەوتی داروسسەلام لە هەڵەبجەم خوێندووە، دوای ئەوەی کە بۆ خوێندن چوومە بەغدا قیرائەتی حەفصم لە خزمەت مامۆستا جەمال کوبەیسی خوێند و لە خزمەت چەند مامۆستایەکی زانا و ناوداری جیهانی ئیسلامی بە خوێندنی زانستەکانی دیکە بەهرەمەند بووم، لەو بەڕێزانە هۆزان و پیتۆڵی گەورە جەنابی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس کە موفتی عێراق بوو لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادر گەیلانی، هەروەها جەنابی مامۆستا شێخ تاهیری بەرزنجی لە مزگەوتی خاصکي --خوای گەورە هەردوو بەڕێزیان بە فیردەوسی باڵا شاد بکات- ، هەروەها پرۆفیسۆر دکتۆر محەمەد ڕەمەزان عەبدوڵڵا ئەلشەوانی لە مزگەوتی (البنیه) و مزگەوتی (البرکە) کە خۆم وتارخوێن و پێشنوێژی بووم، هەروەها جەنابی پرۆفیسۆر دکتۆر مستەفا زەڵمی لە ماڵی بەڕێزیان -خوای گەورە تەمەن و زانستی هەردوو بەڕێزیان پڕ بەرەکەت بکات.

لە پاشان ئیجازەی زانستیم لە خزمەتی هەر یەك لە مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مامۆستا شێخ تاهیری بەرزنجی و دکتۆر مستەفا زەڵمی وەرگرت، ئەگەر مەبەست لە پرسیارەکە خوێندنی ئەکادیمیی بێت، ئەوە خوێندنی قۆناغی یەك و دووی

سەرەتاییم لە گوندی خەرپانی سەر بە قەزای هەڵەبجە خوێندووە، لە پاشان دوای وێران کردنی گوندەکە لە ساڵی 1979ز لایەن ڕژێمی بەعسەوە هاتینە هەڵەبجە و دەستم بە خوێندن کردەوە و سەرەتاییم لە قوتابخانەی ئەحمەد موختار جاف تەواو کرد و ناوەندی و پۆلی چوار و پێنجی دواناوەندیم لە قوتابخانەی ئامادەیی خوێندنی ئیسلامی لە هەڵەبجە تەواو کردووە.

لە پۆلی شەشدا کارەساتی دڵتەزێنی کیمیابارانی هەڵەبجە بووە هۆکاری ئەوەی پۆلی شەش تەواو نەکەم و بەرەو ئێران ئاوارە بووین، دوای گەڕانەوەمان بۆ عێراق لە سلێمانی لە یەك ژووردا لەماڵی خاڵم خۆمان شاردەوە و لە ئامادەیی خوێندنی ئیسلامی

گوتاری ئایینی بە شێوەیەکی گشتی لە ئاستێکی زۆر نزمدایە، جۆشدانی عاتیفە و سۆز باڵی بە سەر وتار و شێوازی بیرکردنەوە و دەربڕیندا کێشاوە و بە سەر لۆژیک و عەقڵ و واقعدا زاڵبووە

پۆلی شەشم تەواو کرد و سوپاس بۆ خوای گەورە لە سەر ئاستی عێراق پلەی یەکەمم بەدەست هێنا، لە زانکۆی بەغدا — کۆلیژی زانستە ئیسلامیەکانم تەواو کرد و بۆ خوێندنی ماستەر دوای تاقیکردنەوەی توانستی زانستی لە زانکۆی سەددام —کە ئێستە بە زانکۆی العراقیە ناسراوە— وەرگیرام، بەڵام دوای تەواوکردنی هەردوو کۆرسی خوێندن بە پێی بریارێك کە دیوانی سەرۆکایەتی عێراقەوە و بە فەرمانی سەددام قوتابییە کوردەکان لە زانکۆ دەرکرانە دەرەوە، کە لەو ساڵەدا تەنیا دوو قوتابی کورد بووین.

دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر لە زانکۆی بەغدا وەرگیراینەوە و ماستەر و دکتۆرامان تەواو کرد.

ماستەرەکەم لە ژێر ناو نیشانی (المشترك وأثره في اختلاف الفقهاء) بە پلەی نایابی باڵا لە ساڵی 1997ز.

تێزی دکتۆراکەیشم بە ناونیشانی (تأويل النصوص عند الأصوليين) بە پلەی نایابی باڵا لە مانگی یەکی 2003ز.

**پەیامی راستی : کارە بەپێزەکانت( کە خۆی لە وانە وتنەوە و موحازەرە دەبینێتەوە زیاتر) کەی و چۆن دەستی پێکرد؟**

دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی: دەستپێك لە قوتابخانەی شێخ مەعروف کەرخی لە بەغدا و، لە دواییدا پێش ئەوەی بڕوانامەی ماستەر وەربگرم داوام لیٚ کرا لە زانکۆی بەغدا چەند بابەتێکیان بۆ بڵێمەوە، ئەم کارەش وەك تایبەتمەندییەك بوو بۆ من، چونکە مەرجی وانە گوتنەوە لە



زانکۆکاندا دیار بوو کە دەبێت بڕوانامەی ماستەرت بەدەست هێنابێت.

دوای تەواکردنی قۆناغی ماستەر وەك مامۆستا و سەرۆکی بەشی (الدعوة والخطابة) لە کۆلیژی (الإمام الأعظم) دامەزرام، لە دوای تێکچوونی باری ئەمنی بەغدا چوومە زانکۆی کۆیە و کرامە سەرۆکی بەشی شەریعە و لە قۆناغی بەکالۆریۆس و ماستەر وانەم دەگوتەوە، دواتر ڕاژەم گواستەوە بۆ زانکۆی سەلاحەددین و لە کۆلیژی زانستە ئیسلامییەکان جێگیر بووم، ماوەیەك ئەرکی جێگری ڕاگر و سەرۆکایەتی بەشی خوێندنی ئیسلامیم پیٚ سپێردرا و ئێستاش بەردەوامم لە وانە گوتنەوە.

بۆ وانەکانی دەرەوەی دەزگا فەرمییەکانیش لە بەغدا و هەولێر قوتابی خۆمم بووە و وانەکانی (نحو و صرف و منطق و فقه و أصول الفقه و علم الحديث)م گوتووەتەوە، سوپاس بۆ خوای





گەورە ئێستاش بەردەوامم.

**پەیامی راستی : زیاتر چی دەخوێنیتەوە، بەچ نووسەرێك زۆر كاریگەری، چ كتێبێك زۆر سەرسامی كردووی؟**

دكتۆر عوسمان هەڵەبجەیی: چی دەخوێنمەوە؟ بابەت و چەمك و زانستێكی دیاری كراوم نییە، ئەوەی پێویست بێت دەخوێنمەوە، هەر چۆن نووسینی زانا گەورەكانی ئیسلام دەخوێنمەوە بە هەمان شێوەش نووسینی بێ باوەڕان و شوێنكەوتووانی ئایین و ئایینزاكانی دیكەش دەخوێنمەوە و ئاگاداری گومان و ڕەخنە و تێبینی نەیارانی ئیسلامم.
بەبەردەوام موتاڵای بەناو پەڕتووكی پیرۆز دەكەم، زۆر حەزم لە فەلسەفە و عیرفانە، بەڵام لە هەمووی زیاتر عاشق و عەودالی بابەتە قورئانییەكانم، قورئان خانە خاڵیەكانی ژیانمی پڕكردووەتەوە و ژیانێكی نوێی بە عەقڵ و هۆش و هزر و بیر و ڕۆح و گیانم بەخشیوە.

بەڵام بە چ نووسەرێك سەرسامم؟ نووسەر زۆر هەن بەڵام هەریەك لە بابەت و چەمكێكدا، بەڵام لە سەرووی هەموویانەوە هەردوو غەزالی: ئیمامی (حجة الإسلامي غزالی) و (محمد غزالی میسری)، هەمیشە عەودالّ و عاشقی دەست وپەنجە و قەڵەمە ڕەنگینەكانی شێخی (ابن القیم)م — ڕەحمەتی خوای گەورەیان لێ بێت—.

**پەیامی راستی : بۆ ئەوەی خەڵكی ئێمە چێژ و سوود لە وتار و موحازەرە ئایینییەكان وەربگرێ چی بكرێ باشە؟**

دكتۆر عوسمان هەڵەبجەیی: گوتاری ئایینی بە شێوەیەكی گشتی نەك تەنیا لە كوردستاندا بەڵكو لە جیهانی ئیسلامیدا لە ئاستێكی زۆر نزمدایە و بەرەو ئاقارێكی زۆر خراپ و هەڵدێر هەنگاو دەنێت، كاتێك گوێ لە زۆر بانگخوازە ناودارەكانی جیهانی ئیسلامی دەگرم دەبینم و دەبیستم كە جۆشدانی عاتیفە

**هەندێ لە فەرمانبەران لە بەر شەونوێژ و ڕۆژووی سوننەت ناتوانن وەك پێویست كاری خەڵكی ئەنجام بدەن، نازانن كە ئەنجامدانی كاری خەڵكی ئەرك و واجبە و شەونوێژ و ڕۆژووی دووشەممە و پێنجشەممان سوننەتە ناكرێت لە بەر سوننەت واجب واز لێ بێنیت**

و سۆز باڵی بە سەر وتار و شێوازی بیركردنەوە و دەربڕینیاندا كێشاوە و بە سەر لۆژیك و عەقڵ و واقعدا زاڵ بووە، خەڵكیش ئەوەندەی حەز و





ئارەزووییان لە بیستنی وتارێکی عاتیفی و چیرۆك ئامێز و گریاندن و خۆتووڕەکردنە ئەوەندە هەواداری بیستنی وتارێك نین کە هاوسەنگی نێوان عاتیفە و عەقڵ و ڕۆح بپارێزێت.

بۆیە دەبینین هەندێك لەو بانگخوازانە لە وتارەکانیاندا هانا بۆ هەندێك بەناو موعجیزات دەبەن و خۆیان و خەڵکی بەستەزمانی پێ دەگریەنن، ئیدی ئەو بەناو موعجیزەیە هێلکەیەك بێت (نعوذ بالله) ناوی پیرۆزی (الله)ی لە سەر نووسرابێت و لە پاشەڵی پیسی ڕیقناوی مریشکێك هاتبێتە دەر، یاخود جالّجالۆکە یا درەخت یا شووتیەك بێت کە ناوی خۆشەویستمانی لە سەر نووسرابێت، یا خود وێنەی ئافرەتێك بێت گاڵتەی بە قورئان کردبێت و بووبێتە مەیموون، یان هەر ئاژەڵ و درندەیەك، یاخود دەیان و سەدان درۆ و دەلەسە و خورافاتی بەم شێوەیە.

لەکاتێکدا دەبوایە ئەو بەڕێزانە لە بری باسکردنی نووسینی ناوی پیرۆزی (الله) و (محمد) لە سەر هێلکە و درەخت و ولاخێك باسی گەورەیی خودی هێلکە و دار و درەخت و گیاندارەکانیان بکردایە، خودی ئەوانە بەڵگە و موعجیزە و گەواهیدەرن لە سەر دەسەلاتی خوای گەورە و بالادەست، کەسێك ڕاستی و حەقیقەتەکان کاریگەرییان لەسەر نەکەن بەو خورافات و درۆ و دەلەسانە نەك باوەڕمان پێ ناکەن، بەڵکو دەمانکەنە بنێشتە خۆشەی سەر زاریان هەمیشە دەماندەنە بەر گاڵتە و

**مامۆستایانی وەك موفتی زەهاوی و قزلجی و جەنابی مودەڕیس گەر لە شاری خۆیان بمانایەتەوە کەس نەیدەناسین، بەڵام گەر بهاتبایە و عێراقیان بەجێبهێشتبایە ئەو کاتە زیاتر زانست و توانا و پیتۆلی ئەم زاتانە دەردەکەوت**

توانج و بە عەقڵمان پێدەکەنن، بۆ سەلماندنی ئەم بابەتەش سەردانێکی تۆڕی جالّجالۆکەیی بکە، تا بە چاوی خۆت ببینیت بەراورد لە نێوان ئەو دوو شێوازە وتارانە بکەیت و زیاتر لەوەش ببینیت گەر هەواڵێکی درۆ و خوراف بلاو کرابێتەوە چۆن لە ماوەیەکی کەمدا چەند ملیۆن کەس لایکی دەکەن و سەرسامی خۆیان تۆمار دەکەن تا ڕادەیەك کە هیچ وتارێکی زانستی ئەوەندە و نیو ئەوەندە لایك نەکراوە و نایشکرێت، لە کاتێکدا دوای بەدواداچوون بۆ ئەم کارانە دەستکرد و دروستکراو و مۆنتاژی نەیارانی ئیسلامن و بۆ گاڵتە بە عەقڵی موسڵمانان ساختەکارییان تێدا کردووە.

**پەیامی ڕاستی: ئێمە لە نوێژی هەینی و بۆنە ئایینییەکاندا گەرموگوڕییەکی زۆری خەڵکی دەبینین، بەڵام لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەماندا بەرامبەر یەکتری و بەرامبەر ئەوەی ئایینەکەمان فەرزی کردووە لەسەرمان کەمتر ڕەنگی دەداتەوە، هۆیەکەی بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی: هۆکاری سەرەکی ئەم دیاردە نامۆ و درێژە ئەوەیە کە ئامادەبوونی زۆربەی ئامادەبووانی نوێژ و وتاری هەینی لەبەر سوود وەرگرتن و باوەڕ زیادکردن و چاکسازی بیر و هزر و هەڵسوکەوت نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئەرکێکە و خۆشی بێت یان ترشی بێت دەبێت لە کۆڵی خۆی بکاتەوە.

لە لایەکی دیکەشەوە خەریکە مزگەوتەکانمان وەك کڵێسای گاورەکانی لێهاتووە، هەفتەی ڕۆژێك سەردانی دەکات، ئەگەر هەموو نوێژەکانیش بە جەماعەت و کۆمەڵ ئەنجام بدات و حەج و عومرە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان خۆی لەدەست نەدات، وا دەزانێت بەو کارانە بەهەشتی بەرینی بۆ خۆی مسۆگەر کردووە و نازانێت زوڵمی ساتێك کردەوەی دەیان ساڵ پووچەڵ دەکاتەوە، خوای گەورە مافی خەڵکی پەیوەست نەکردووە بە نوێژ و ڕۆژوو و حەج و عومرەوە، بۆیە ئیمامی غەزالی باسی هەندێك لەو جۆرە کەسانەمان بۆ دەکات





و دەفەرموێت: هەندێکیان ساڵ بە ساڵ حەج و عەمرە دەکەن بە دڵێکی خۆشەوە دەگەڕێنەوە لای ماڵ و منداڵیان، لە کاتێکدا دراوسێکەیان لە بەر هەژاری و نەداری دەناڵێنێت، ئەو کەسە نازانێت هەموو هەنگاوێکی حەج و عومرەکەی بە گوناە بۆ دەنووسریت.

یاخود گلەیی لە هەندێك دەکات کە بە دوو ڕکات شەونوێژ لە چوار ڕکاتەکەی نیوەڕۆ زیاتر دڵیان خۆشترە، یا بە ڕۆژوویەکی سوننەت لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان زیاتر دڵیان خۆشترە، هەندێکیان لەوانە فەرمانبەرن لە بەر شەونوێژ و ڕۆژووی سوننەت ناتوانن وەك پێویست کاری خەڵکی ئەنجام بدەن، نازانن کە ئەنجامدانی کاری خەڵکی ئەرك و واجبە و شەونوێژ و ڕۆژووی دووشەممە و پێنجشەممان سوننەتە ناکرێت لە بەر سوننەت واجب وازی لێ بێنیت، لە کۆتایی مانگدا مووچەیەکی حەرام وەربگریت.

**پەیامی ڕاستی : بە بڕوای تۆ مزگەوت لە کوردستاندا لەگەڵ ئەوەی لەڕووی میعماری و جوانکارییەوە تا ئاستێکی زۆر بەرەو پێش چووە، ئایا لە ڕووی پێگەیاندنی فەقێ و زانا و شارەزای ئایینی و ئاوەدانی بە پەرستشەکانیشەوە ئەو هەڵکشانەی پێوە دیارە؟**

دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی: ئاستی زانستی لە ڕووی پێگەیاندنی فەقێ و زانا و شارەزای ئایینی زۆر لە ئاستێکی نزمدایە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك، وەك کەمتەرخەمی دەسەڵات کە هەندێك مامۆستای ناشیاو و نەخوێندەواری پێگەیاندووە کە پێویستە بگەڕێندرێنەوە بۆ قۆناغی ناوەندی و خوارتریش، مامۆستا کە نەخوێندەوار بوو چاوەڕێی چی لە قوتابی بەستەزمان دەکەیت، مامۆستای وامان هەیە نەك لە قوتابخانەکاندا بەڵکو لەسەر ئاستی زانکۆ باسی سورەتی قاف و نوونی کردووە گوتوویەتی: سوورەتی (ق) سوورەتی (ن)، نەیزانیوە بڵێ قاف و نوون.

هۆکارێکی دیکەش دیاردەیەکە گشت چەمکەکانی زانستی هەر لەو زانستانانەی کە لە حوجرەکاندا دەخوێنرێت تاوەکو یاسا و ئابووری و ڕامیاری و ئەندازیاری و پزیشکی و هتد... گرتووەتەوە، ئەویش دیاردە و نەخۆشی بەدەستهێنانی بڕوانامە و ڤایرۆسی دال، واتە دکتۆرا، بەدەستهێنانی بڕوانامە بووەتە مەبەست، خەڵك ئێستا بەدووی دالی دکتۆراوەیە نەك عەوداڵی زانست و مەعریفەت.

**پەیامی ڕاستی : بەبڕوای جەنابت ئێمەی کورد بەکۆمەڵێك زانای پایەبەرز دەوڵەمەندین، کە ژمارەیان بەرچاوە، کەلە ئاستی ئەوە بوونە ئیجتهاد لە زۆرێك لە مەسائیلی فیقهیدا بکەن، کەچی بەڕوونی ئیجتهادەکەیان نەخستووەتە ڕوو... دەبێ هۆکاری ئەمە چی بێت....؟**

دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی: زانایانی کورد لەبەر زیادە لە خواترسی و خۆ نەویستی و خۆ بەهیچ نەزانین، توخنی ئیجتهاد نەکەوتوون، لە کاتێکدا گەر بەراوردیان لەگەڵ زانایانی قەوم و میللەتەکانی دیکە بکرێن، دەبینرێت هیچیان لەوان کەمتر نییە، بەڵکو زۆریان لەوان لەپێشتر بوون.

لە لایەکی دیکەوە بە بڕوای من ئەو زانا بەڕێزانە وڵاتی خۆیان و مانەوەیان لە شار و وڵاتی خۆیان کووشتوونی، بە درێژایی مێژوو دەبینین کەڵەزانای گەورەمان هەبووە، چونکە وڵاتی خۆیان بەجێنەهێشتووە ناویان نەگەیشتووەتە جیهان و هەر وەك مەلاکانی دیکەی کوردستان سەریان ناوەتەوە و کەس باسیان ناکات.

مامۆستایانی وەك موفتی زەهاوی و قزڵجی و جەنابی مودەڕیس گەر لە شاری خۆیان بمانایەتەوە کەس نەیدەناسین، بەڵام گەر بهاتبایە و عێراقیان بەجێبهێشتبایە ئەو کاتە زیاتر زانست و توانا و پێتۆڵی ئەم زاتانە دەردەکەوت و واقیع وای لێ دەکردن کە دونیایەکی دیکە ببینن و ئەو خۆ بە کەم زانینەیان نەبێتە ڕێگر لە بەردەم ئیجتهادیادا.

**پەیامی ڕاستی : دوا وتەی جەنابتان، یان شتێك گرنگ بێت و باسمان نەکردبێ ؟**

دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی: زۆر سوپاسی بەڕێزتان دەکەم و لە خوای گەورە داواکارم کە هەمیشە هەڵگری پەیامی ڕاستی بن.

## وەرگێڕ و ڕۆژنامەنووس، بیلال باسام:

# لای من هیچ کاتێك وەرگێڕان ئامرازێك نییە بۆ کاسپی و پارە پەیداکردن



**دیمانەی: هەستیار هەورامی**

یەکێک لە باشترین هۆکارەکانی ڕۆشنبیریو هۆشیاربوونو ئاشنابوون بە مێژوو و کلتوورو زانستو مەعریفەی گەلانی دیکە وەرگێڕانە، کە دەروازەیەکی گەورەو ڕێگەیەکی پڕ لە ڕووناکیو ئاسمانێکی پڕ لە ئەستێرەی درەوشاوەی زانستو هونەرو مەعریفەو ئەدەبو عیرفانە.

کایەی وەرگێڕان یەکێکە لە گرنگترین کایە ڕۆشنبیرییەکانو هەر گەلێک بیەوێ پێشبکەوێت ناکرێ بایەخی تایبەتو پێویستی پێنەدات، گەلی کوردیش تا ڕادەیەک سودی لەم کایە گرنگە وەرگرتووە، کە دەتوانین وەرگێڕان بە (زانستو هونەرو پیشە) بناسێنین، بەڵام مەخابن لەگەڵ ئەو سود وەرگرتنەشدا جۆرێک لە

**شپرزەیی و بێبەرنامەیی پێوە دیارە، ئەگەرچی چەندین هەوڵی جوان و بایەخدار دەبینرێن و کەسانی شارەزاو بەئەزموون و دڵسۆزیش لەو بوارەدا کارو بەرهەم و کتێبی جوانیان پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کردووە.**

**بە مەبەستی ئاشنابوون بەم بوارە گرنگە (وەرگێڕان) یەکێک لە وەرگێڕە باش و سەرکەوتووەکانی هەرێمی کوردستان بەڕێز (بیلال باسام)مان بەسەر کردەوەو چەند پرسیارێکمان ئاراستە کرد، بەڕێزیشیان پەرۆشانەو بەم چەشنە وەڵامی دایەوە.**

**پەیامی ڕاستی: دەکرێ پێمان بڵێن لای جەنابتان وەرگێڕان چییە؟**

بیلال باسام: وەرگێڕان لای من حەزو خولیاو ئارەزوویەکی تاکەکەسییەو کۆشش و ماندووبوونی تاکەکەسی پێویستە، کە تێیدا سەلیقەو تواناو خولیای وەرگێڕ ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەگێڕێت، هەستکردنە بە بوونی کەلێنێك لە کتێبخانەو بواری مەعریفی و ڕۆشنبیری میللەتەکەمدا کە بە ئەرکی خۆمی دەزانم پڕی بکەمەوە، وەرگێڕان چوونە ناو دونیایەکی نوێ و دەرچوونە لە زمانی زگماك و لەبازنەی کتێبخانەی کوردی و نووسەرەکانی و پێنانە ناو جیهانێکی یەکجار فراوانتر لەوەی کە لە کتێبخانەی کوردیدا دەیبینیت، زۆربەی جار لەم گوڵجارەدا گەلێك گوڵی جوانترو خۆشبۆترو شاکاری مەزنترت بەرچاو دەکەوێت کە لە باخچە چکۆلانەکەی خۆماندا نییە، ئیدی وادەزانیت کە نابێ بەبێ سەوقاتی و دیاری بگەڕێیتەوە، لای من هیچ کاتێك وەرگێڕان ئامرازێك نییە بۆ کاسپی و پارە پەیداکردن، هەرچەند ڕەنگە لە میانی پرۆسەی وەرگێڕان بۆ دەزگایەك یان ناوەندێکدا ئەمەشت دەست بکەوێت.

**پەیامی ڕاستی: جۆرەکانی وەرگێڕان کامانەن و کامیان باشتر پەیامی نووسەرو دەقی نووسینە ئەسڵییەکە باشتر دەگەیەنێ؟**

بیلال باسام: وەرگێڕان بەگشتی ئاماژەیەکە بۆ هەموو ئەو پرۆسەو ڕێبازانەی بۆ گواستنەوەی مانای دەقێك لە زمانی بنەڕەتەوە بۆ زمانی مەبەست دەیگرینەبەر، ئەمەش لە ڕێی بەکارهێنانی ئەو وشانەوە کە هاوواتای وشەکانن لە زمانی بنەڕەتدا، هەروەها لە ڕێی نووسینی وشەی نوێوە بۆ ئەو زاراوەو داهێنراوە تازانەی کە لە زمانی کوردیدا نین، وەك کۆمپیتەر، ویندۆز، سەتەلایت وهتد.. بەڵام لەمە گرنگتر خودی وەرگێڕانە کە ئێمە چی وەردەگێڕین؟

ئێمە لە وەرگێڕاندا واتا وەردەگێڕین بەبێ ئەوەی لە مەبەستی سەرەکی نووسەر دوور بکەوینەوە یان ونی بکەین، ڕاستە لە زماندا ڕێزمان وەرناگێڕدرێت، بەڵام نکوڵی لە زانینی ڕێزمان ناکرێت بۆ تێگەیشتن لە دەق، دەکرێت وەرگێڕان وشەیەك بێت هەروەك چۆن دەکرێت ئیدیۆم یا پەندی پێشینانێك بێت، یاخود ڕستەیەك بێت کە هەریەك لەمانە واتایەکی بچوك یان گەورە بەدەستەوە دەدەن، هەرچەند لە وەرگێڕاندا مانا وەردەگێڕدرێت، بەڵام هەرگیز لە بایەخی وەرگێڕانی وشە بە وشە کەم ناکرێتەوە، بەتایبەت ئەگەر وەرگێڕ هێندە توانای




بەسەر هەردوو زماندا بشكێت كە بە سانایی هاوواتا یان هاونرخ لە زمانی مەبەستدا بۆ وشەكانی ناو دەقی زمانی بنەڕەت بدۆزێتەوەو دابنێ.

**پەیامی ڕاستی: بە كێ دەگوترێ وەرگێڕ؟ ئەو كەرەستەو پێویستییانە چین كە دەبێ لە كەسێكی وەرگێڕدا هەبن؟**

بیلال باسام: بە مانا سادەكەی بەكەسێك دەوترێت وەرگێڕ كە كاری وەرگێڕان دەكات لە زمانێكەوە بۆ زمانێكی دی، جا چ بەشێوەی زارەكی بێت یا نووسین، بەڵام كارەكە هەر بەوەندە كۆتایی نایەت، بەتایبەت كە لێرەدا مەبەستمان وەرگێڕانی نوسراوو زمانی نووسینە، هەربۆیە لەمەیاندا بەكەسێك دەوترێت كە شارەزایی وردی هەبێت لە هەردوو زمانی لێوەرگیراوو بۆ وەرگێڕدراو،




عەرەب وەرگێڕان بە ڕاڤەو لێكدانەوە پێناسە دەكەن، بەم پێیە پێویستە وەرگێڕ سەرەتا خۆی بەباشی لە دەقەكە بگاتو هەرسی بكات، پاش ئەوە دەست بكات بە وەرگێڕانی، چونكە كەسێك خۆی تێنەگات توانای تێگەیاندنی ئەویتری نییە، شارەزاییەكی باشی لە زمانی یەكەم (زگماك)دا هەبێتو خوێندنەوەی بەردەوامی هەبێت، تاوەكو لە وشەو زاراوەی نوێو بەرەو پێشچونەكانی زمانو ئەو گۆرانكاریانەی بەسەر زمانی نووسیندا دێن دانەبڕێت، پێویستە ڕۆشنبیرییەكی فراوانی هەبێت، واتە باكگراوندێكی فراوانی هەبێت لەمەڕ ئەو بابەتەی كە وەرگێڕانی بۆ دەكات، پشوو درێژو بەحەوسەڵەبێت، چونكە وەرگێڕان پێویستی بە

مومارەسەو مەشق و گەڕان و دۆزینەوەی هاوواتایە، لە کۆتاییدا پێویستە زۆر بە باشی لە ناوەڕۆک و ڕوخساری دەق و مەبەستی نووسەر بگات، تاوەکو سەرکەوتووبێ لە کارەکەیدا، هەروەک پێویستە بەردەوام خوێندنەوەی هەبێت بەو زمانەی وەرگێڕانی لێوە دەکات، تاوەکو لە وشەو زاراوەی تازەو بەکارهێنانەکانی لەو زمانەدا ئاگادار بێت.

**پەیامی ڕاستی: وەرگێڕانی باش و سەرکەوتوو کامەیە؟ چۆن بزانین وەرگێڕ بە باشی و ئەمانەتەوە وەرگێڕانەکەی ئەنجام داوە؟**

بیلال باسام: وەرگێڕانی باش و سەرکەوتوو ئەوەیە کە تێیدا وەرگێڕ توانیویێتی ئەوەی مەبەستی نووسەری زمانی بنەڕەت بووە وەریبگێڕێتە سەر زمانی مەبەست، یاخود خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەی دەقە وەرگێڕدراوەکەدا واهەست بکات لەبەردەم دەقێکی نووسراودایە نەک وەرگێڕدراو، بۆ ئەوەش کە بزانین ئایا وەرگێڕ دەقەکەی بەباشی و ئەمانەتەوە وەرگێڕاوە، پێویستە دوو بنەما هەیە ڕەچاوی کردبێت:

1. دەقی زمانی یەکەم بەبێ کەموکورتی و بە ئەمانەتەوە وەریبگێڕێتە سەر زمانی دووەم.
2. پێویستە ناوەڕۆکی زمانی یەکەم لە وەرگێڕانەکەدا ڕەنگبداتەوە، بەم دوو پێودانگە دەتوانین هەڵسەنگاندن بکەین بۆ دەقە وەرگێڕدراوەکە.

> **لە کرچی کاڵی وەرگێڕان و وەرگێڕانی کتێبی سادە، ناپێویستەوە کە هیچ کەلێنێك لە بواری ڕۆشنبیری ئێمەدا پڕ ناکەنەوە، تا دەکاتە نەپاراستنی ئەمانەتی وەرگێڕان**

**پەیامی ڕاستی: دیارترین کۆسپ و گرفتەکانی بەردەم کەسی وەرگێڕ و پرۆسەی وەرگێڕان چین؟**

بیلال باسام: وەك ئاماژەمان پێکرد، وەرگێڕان حەزو خولیایەکی تاکەکەسی بێ پشتیوانە، ئیدی لەم ڕوانگەوە سەیری بکەیت دەتوانی هەست بە گەورەیی ئەو گرفت و ئاستەنگانەش بکەیت کە دێنە ڕێی کەسی وەرگێڕ، کە هەندێکیان خودین واتە بۆ کەسی وەرگێڕ دەگەڕێتەوە، وەك نەبوونی چەندین جۆر فەرهەنگی یەك زمانەو دوو زمانە بۆ گەرانەوە بۆیان لەکاتی پێویستدا، چونکە هەرچەند کەسی وەرگێڕ شارەزاییەکی باشی هەبێت لە زمانی بنەڕەتدا، بەڵام هێشتا ڕووبەڕووی چەندین وشەو زاراوەی نوێ دەبێتەوە کە پێویستیان بە فەرهەنگ هەیە، یاخود وشەیەك زیاتر لە مانایەك دەبەخشێت و پێویستە مانایەك هەڵبژێرێت کە لەگەڵ سیاقی وشەکە لە دەقە بنەڕەتیەکەدا بگونجێت، نەبوونی فەرهەنگستانێکی زمانی کوردی کە تێیدا زمانەوانە بەتواناکان کاری زاراوەسازی و هاوواتا دانان بکەن، یاخود فەرهەنگێکی گشتگیری کوردی کوردی دابنێن. نەبوونی سپۆنسەر و پشتیوان بۆ وەرگێڕەکان بۆ بەچاپگەیاندنی بەرهەمەکانیان، ئەمانە هێندێکن لەو گرفتانەی ڕووبەڕووی وەرگێڕ دەبنەوە.

**پەیامی ڕاستی: وەرگێڕان چ ڕۆڵ و کاریگەرییەکی هەیە لە پێشخستنی ڕادەی هۆشیاری و ڕۆشنبیری تاك و کۆمەڵگەدا؟**

بیلال باسام: وەرگێڕان کردنەوەی دەرگای کلتوورەکانی ترە بەسەر

خۆماندا، دەتوانێت سەرچاوەیەکی گرنگی مەعریفی بێت بۆ تێرکردنی حەزی خوێنەر لە مەعریفە، دەلاقەیەکە بۆ ئاشنابوون بە بەرهەمی قەڵەمی بیرو ئاوەزو هەستی ناسک و ستایلی ژیان و داب و نەریت و ئاین و سیستەمی حوکمرانی و هتد... هەموو ئەمانە لە ڕێی وەرگێرانەوە دەکرێت پێیان ئاشنا ببین و ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی لە نێوان کلتووره جیاوازەکاندا هەر لەم ڕێیەوە دەکرێت، هیچ کەسێك توانای فێربوونی هەموو زمانەکانی دیکەی نیەو مەحاڵە، هەربۆیە وەرگێران تاکە ئامرازە بۆ خوێندنەوەو تێگەیشتن و سود لێوەرگرتن لە بەرهەمی قەڵەمی کلتوورو زمانەکانی دیکە، هەر بەوەرگێرانە گەلێکی ستەمدیدەی وەك کورد دەتوانێت خۆی بە گەلانی دونیا بناسێنێت و گێتی لە ئازارو نەهامەتییەکانی ئاگادار بکاتەوە، هەربۆیە گومان لەوەدا نییە کە وەرگێران ڕۆڵێکی یەکجار کاریگەری هەیە لە بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری تاکەکانی کۆمەڵگەو کردنەوەی بیرو ئەقڵ و دەرگا داخراوەکان، هەروەها گەشەیەکی هزری و هونەری و مەعریفی بێنێتەدی، لە مێژووی شارستانێتی ئیسلامدا وەرگێران ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە گەشەسەندنی ژیاری ئیسلامیدا، ئەویش لە ڕێی سودوەرگرتن لە بەرهەمی نووسەرە یۆنانی و ئێرانیەکانەوە لە هزرو فەلسەفەو پزیشکی و سیستەمی حوکمڕانیەوە، هەموو ئەمانەش بە وەرگێران دەکرێت، کە ئەقڵ و بیری مرۆڤ لە بازنەی تەسکی زمان و کلتوورو جوگرافیا دەرباز دەکات و هیچ شتێك سنووورداری ناکات، ئاسۆی بینین و تێگەیشتنی فراوانتر دەبێت، ئەگەر لە سایەی تەکنۆلۆژیای گەیاندندا دونیای ئەمڕۆ بووبێتە گوندێکی چکۆلانە، ئەوا بۆ هاتووچۆکردن بەناو کلتوورو فەرهەنگەکانی ئەو گوندەدا وەرگێران لە هەر شتێکیتر پێویستترە.

**پەیامی ڕاستی: ئایا وەرگێران بەم شێوازەی لە هەرێمی کوردستان پەیڕەو دەکرێ، چەنێك خزمەت دەکات؟ پێویست بەوە ناکات کە کاری وەرگێران بە دامەزراوەیی بکرێت؟**

بیلال باسام: گومان لەوەدا نییە کە وەك زۆرێکیتر لە کایەکانی کۆمەڵگەی کوردی، دوای ڕاپەڕین بێسەروبەرییەك بە پرۆسەی وەرگێڕانەوە دیارە، هەر لە کرچ و کاڵی وەرگێران و وەرگێڕانی کتێبی سادەو ناپێویستەوە کە هیچ کەلێنێك لە بواری ڕۆشنبیری ئێمەدا پڕ ناکەنەوە، تا دەگاتە نەپاراستنی ئەمانەتی وەرگێران، چەند بارەکردنەوەی وەرگێڕانی کتێبێك لەلایەن چەند وەگێڕێکەوە، لەبەر ئەوە نا کە وەرگێڕی یەکەم مافی تەواوی بە وەرگێرانەکە نەداوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئێمە لە سێ پارێزگادا ئاگامان لە بەرهەمەکانی یەکتر نییەو تەنانەت ئەمە دەرهەق بە دەزگاو چاپخانەکانیش هەر ڕاستە، هەرچەند چاپخانەکان بە پارە کار دەکەن و ئەوە ئەرکی ئەوان نییە.

سەبارەت بە برگەی دووەمی پرسیارەکەش، ئەگەر بەدامەزراوەیی کردن بۆ کۆنترۆڵکردن و سانسۆرو سنووردارکردن بێت باش نییە، بەدامەزراوەیی کردن لە کۆمەڵگەیەکی ئازادو دیموکراسیدا کە سەرجەم ڕەوتە ڕۆشنبیریەکان و تەوژمەکانی کۆمەڵگە تێیدا بەشداربن، بۆ ئەوەی پێداویستیە ڕۆشنبیری و مەعنەوی و مەعریفیەکانی گشت ئەو لایەنانە پڕ بکرێتەوە ئەوا باشە، بەپێچەوانەوە کارەساتی لێدەکەوێتەوە، چونکە هەر

سەنتەرو رەوتێکی رۆشنبیری سەرباری رۆشنبیری گشتی، پێویستی بە رۆشنبیرییەکی تایبەتیش هەیە، کە رەنگە بەلای ئەو دامەزراوەیەوە لە بەرچاو نەگیرێت، بەتایبەتی سانسۆر لەسەر رۆشنبیری ئیسلامی هەیەو لای خانەی وەرگێرانەکانو دەزگا گەورەکانی ئەم هەرێمە کەمتر ئاور لەو بوارە دەدرێتەوە، یان وەرگێردراوی ئەو بوارە وەردەگرن هەرچەند شاکاریش بێت.

**پەیامی راستی: بەرێزتان لە کەیەوە دەستتان داوەتە کارو پرۆسەی وەرگێرانو چ شێوازێك پەیرەو دەکەن لە وەرگێرانەکانتاندا؟**

بیلال باسام: بەندە ساڵی (1988) لەکاتی کیمیاوی بارانکردنی هەڵەبجەدا، بۆ یەکەم جار کاری وەرگێرانی زارەکیم ئەنجامدا لەناوچەی مەرەخێڵ، کاتێك پرسیارەکانی پەیامنێری کەناڵێکی تەلەفزیۆنی ئێرانیم لەناو ئاوارەکاندا کە لەسەر سنوور گیریان خواردبوو وەردەگێرایە سەر زمانی کوردیو وەلامی ئاوارەکانیشم بۆ دەکردن بەفارسی، لە ساڵی (1994)دا یەکەم بەرهەرم یان بابەتی وەرگێردراوم لە رۆژنامەی (یەکگرتوو)دا بڵاو کردەوە، پێشتریش وەرگێرانی فارسیو عەرەبیم دەکرد، بەلام تەنها بۆ خۆم بوو بەبێ بڵاوکردنەوەی لە بڵاوکراوەکاندا، بەتایبەت ئەو ساڵانەی ئاوارەی ئێران بووین، بەلام لە دوای ئەو بەروارەوە بەبێ دابڕان هەرچەند لەسەرەتاوە کەمیش بوو بەردەوام بووم، لەدوای ساڵی (1998)وە دوای ئەوەی وەك (هەواڵسان)لە (دەنگی یەکگرتوو رادیۆی هەڵەبجەی شەهید) دەستبەکار بووم، ئیتر دەرفەتی زیاترم بۆ رەخسا، بەتایبەت هاورێی ئازیزم مامۆستای خوالێخۆشبوو (ئەکرەم عەنەبی) زۆر هاندەرم بوو، تانا پێکەوە کارمان دەکرد، تانا بابەتی فیکریو رۆشنبیری بۆ دەهێنام تاوەکو وەریانبگێرم بۆ ناوەندو دەزگاکانی بڵاوکردنەوە.

سەبارەت بەو رێبازەی کە لە وەرگێراندا پەیرەوی لێدەکەم، پێموایە زۆرێك لەو کاری وەرگێرانەی کە لە هەرێمدا دەکرێت وەرگێرانی دەقاودەقەو وشە بەوشەیە، هەرچەند زۆر جار چەند شێوازێکی وەرگێران لە دەقێکدا کاری پێدەکرێت، وشە بەوشە یان وەرگێرانی رستەیی یاخود وەرگێرانو گواستنەوەی مانا لە زمانی سەرەتاوە بۆ زمانی مەبەست، منیش لەو حاڵەتە بەدەر نیم.

**پەیامی راستی: بەرێزتان چەند بەرهەمێکتان وەرگێراوە، گرنگترینی ئەو بەرهەمانەتان بەلای خۆتانەوە کامیانە؟**

بیلال باسام: سەبارەت بە بەرهەم، دەمەوێت بڵێم من لە سەرەتای رووکردنە ئەم بوارە، زیاتر بە وەرگێرانی بابەتی رۆژنامەوانی دەستم پێکرد، پاش ئەوە رووم لە وەرگێرانی وتارو مەقالاتی فیکری، سیاسی، رۆشنبیری، رۆشنبیری ئاینی کرد، لەو بوارەدا دەیان وتاری رۆشنبیری بەگشتیو رۆشنبیری ئاینیو فیکریو سیاسیو دیمانەم لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاو کردۆتەوەو بەردەوامیشم، بەلام بەرهەمی لەچاپدراو تا ئێستا، پێنج کتێبم لەچاپداوە: ( 50 شێوازی سادە بۆ راهێنانی منداڵ لەسەر خوێندنەوە)و (رازەکانی دەوڵەمەندبوون)و بەشداریکردن لە وەرگێرانی کتێبی (فەرهەنگی زاراوەکان)و (پەرستگای بێدەنگی)و (نامە عیرفانیەکان)یش بە هاوبەشی لەگەڵ هاورێی خۆشەویستم

(موحسین جەلال)دا، هەروەها کتێبی (تکایە مەبنە مەڕ) کە شاکارێکی گەورەی نووسەری ناوداری ئێرانی (دکتۆر مەحمودی نامەنی)یە، هەرچەند لەلایەن دەزگای موکریانەوە دەستکاری ناوی کتێبەکە کراوەو خۆم پێشتر ناوێکی دیکەم بۆ دانابوو، بەڵام کتێبەکە لە زێدی خۆیدا دەیان جار لە چاپدراوەو شیاوی ئەوەیە هەموو تاکێك بیخوێنێتەوە، وا هەستدەکەم کتێبێکی باشم پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کردووە، ئێستاش چەند بەرهەمێکمان ئامادەی چاپکردنە لەوانە کتێبی (ئاکاری شارستانی و بنەماکانی هاوڵاتیبوون) کە زۆر دڵم پێی خۆشەو وادەزانم یەکێکە لەو کتێبە دانسقانەی کە کۆمەڵگەی کوردی‌و کتێبخانەی کوردی پێویستی پێیەتی، زیادەڕەوی ناکەین گەر بڵێین هەموو ماڵێك پێویستی پێیەتی‌و تەنانەت دەکرێت ببێتە بەشێك لە مەنهەجی خوێندن لە قۆناغی ئامادەیی دا، کە ئومێدەوارم بەمزوانە بکەوێتە بەردیدەی خوێنەران.

کتێبێکی دیکەی تەنز ئامێزم بەناوی (لە دەفتەری بیرەوەری ئاژەڵان) تەواو کردووە، کە لەسەر زمانی گیانلەبەرانەوە گەلێك ڕەخنەو گازەندە لە کارو کردەوەو دەسەڵاتی مرۆڤەکان گیراوەو شتێکی دانسقەیە، جگە لەمانەش چەند بەرهەمێکی عاریفانەی نوسەری دیاری ئێران خاتوو (عیرفان نەزەر ئاهاری)مان لەگەڵ کاك (موحسین جەلال)دا ئامادەی چاپکردنو مۆڵەتی نووسەریشمان وەرگرتووە، بەڵام مەخابن سپۆنسەرێکمان دەست ناکەوێت بۆ چاپکردنی ئەو کارە، چونکە وەك دەوترێت یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی وەرگێڕ لەم وڵاتەدا، ئەوەیە کە هیچ پشت‌و پەنایەکی نیە، خوێنەریش لەم هەرێمەدا سنووردارەو پێشکەوتنەکانی تەکنۆلۆژیای زانیاریەکان بەتایبەت ئەنتەرنێت کاریگەری نێگەتیفی کردۆتە سەر پرۆسەی خوێندنەوەو ژمارەی خوێنەرە جدییەکانی زۆر کەمکردۆتەوە، بۆیە بەرهەمێك هەرچەند زۆر باشیش بێت، هێشتا لە سەر ڕەفەی کتێبخانەکاندا دەمێنێتەوەو تۆزی لێدەنیشێت، من بەحوکمی ئەوەی کارمەندی کتێبخانەم، زۆر بە ڕونی هەست بەم گرفتی نەخوێندنەوەیە دەکەم، بۆ سەروبەری بازاڕی وەرگێڕانیش خوێنەری چەواشە کردووە، ئەگەر ئەم هۆکارانە نەبوونایە دەکرا گەلێك بەرهەمی باشتر پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی بکەین.

***

## پرۆفایل

بیلال باسام موحەممەد، لەدایکبووی (1968) لە گوندی (بامۆك)ی سەر بە هەڵەبجەی شەهید، دەرچووی ئامادەیی‌و فەرمانبەری کتێبخانەی گشتی هەڵەبجە، ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، لە ساڵی (1998) تا ئێستا بەرپرسی بەشی (هەواڵ‌و سیاسەت)ی دەنگی یەکگرتووڕادیۆی هەڵەبجەیە، شارەزای هەردوو زمانی فارسی‌و عەرەبییەو لە (1994)ەوە لەو دوو زمانەوە کاری وەرگێڕان دەکات‌و چەند کتێبێکی بە چاپ گەیاندووە، خێزاندارەو خاوەنی چوار منداڵە.

# فائیزە عەلی:

# سپێدە ماڵی دووەمی منە و زۆرم خۆش دەوێ



ئا: پەیامی ڕاستی

فائیزە عەلی ئەحمەد لە دایکبووی ساڵی 1980 ی هەولێرە

دەرچووی بەشی

زمانی عەرەبی پەیمانگەی مەلبەندی مامۆستایانە

لە ساڵی 2005 هاتووەتە ناو بواری ڕاگەیاندن

سەرەتا پێشکەشکاری ڕۆژانەی ئێزگە بووە لە دەنگی یەکگرتوو. ڕادیۆی هەولێر

پاشان پەیامنێری تەلەفزیۆنی یەکگرتوو. دواتریش دۆبلێری سەرجەم فیلمە دۆبلاژکراوەکان و بێژەری هەواڵەکان لە تەلەفزیۆنی یەکگرتوو کەناڵی هەولێر.

ئێستاش بێژەری هەواڵەکانە لە کەناڵی ئاسمانی سپێدە.

**پەیامی ڕاستی: چۆن هاتیتە ناو کاری ڕاگەیاندن و سەرەتا لە کوێ دەستت پێکرد؟**

**فائیزە عەلی:** هاتنم بۆ ناو کاری ڕاگەیاندن دەگەڕێتەوە بۆ خولیا و حەزێك کە لە منداڵییەوە هەمبوو، کە هەر لەقۆناغی سەرەتاییەوە ئارەزووی ئەم بوارەم هەبوو، بۆیە بەردەوام پرۆڤەم لەسەری دەکرد، ئەویش بەخوێندنەوەی زۆر و کارکردن لەسەر چۆنیەتی دەربڕین و جوان خوێندنەوە، بەو هیوایەی ڕۆژێك ئاسۆکان لەپێشمدا بکرێنەوە و بەم خولیایەم بگەم، بێگومان ئەمەش بەهاندانی مامۆستاکانم، بەشێوەیەك هەر کەسێك گوێی لەخوێندنەوەی من بوایە هانی دەدام بۆئەوەی ببمە بێژەر, سەرەڕای هاندانی زۆری خانەوادەکەم بۆ کارکردن لەم بوارەدا. تا لە ساڵی 2005 کە وەکو مێوانێك سەردانی دەنگی یەککگرتوو- ڕادیۆی هەولێرم کرد کە تەنیا خوێندنەوەی بابەتێك لەم ڕادیۆیە منی کردە پێشکەشکاری بەرنامەی ڕۆژانەی ئێزگە و بێژەری هەواڵەکان. بۆیە ڕادیۆ بە قوتابخانەی پێگەیاندن و گەشەکردنم دەزانم.

**پەیامی ڕاستی: کێ هاندەرت بوو؟ چەندە ئاسوودەی لەکاری ڕاگەیاندندا؟**

**فائیزە عەلی:** من لەژیانمدا کەسانێکی زۆر هەن کە خۆم بە قەرزاریان دەزانم و خۆشم دەوێن، چونکە بەردەوام هانیان داوم سەرەتا لەماڵەوە دایك و باوك و خوشك و براکانم، لەدەرەوەش لەناو دەزگاکانی یەککگرتوو سەرجەم کارمەندانی دەنگی یەککگرتوو، تەلەڤزیۆنی یەککگرتوو و کەناڵی سپێدە. لەناو سەرجەم ئەم دەزگایانەدا هەردەم وا هەستم کردووە هەر

**لەدەرەوەی کاری ڕاگەیاندن کاتەکانم بەگوتنەوەی وانە و پەروەردەکرنی قوتابییان بەسەردەبەم. سەرەڕای خویتدنەوە کە زۆر حەزم لێیەتی. هەولم داوە لە هەموو بوارەکاندا**



سالی 2005 وەکو مێوانێك سەردانی دەنگی یەکگرتووم کرد. تەنیا خوێندنەوەی بابەتێك لەم ڕادیۆیە منی کردە پێشکەشکاری بەرنامەی ڕۆژانەی ئێزگە و بێژەری هەواڵەکان

لە ماڵەوەم، ئەوەندە ڕێزم لێ گیراوەو هان دراوم بۆ بەردەوام بوون، بۆیە ئەمانە وایان لێ کردم زۆر زۆر ئاسوودە بم، تەنانەت لەکاتی بێزاری و بێ تاقەتیشدا بەهۆی کاری زۆر و ماندووبوونەوە نەتوانم دەستبەرداری ببم، کە ئەمەش شانازییەکی تری ڕاگەیاندنی یەکگرتووە.

**پەیامی ڕاستی: ڕۆڵی ئافرەت چۆن دەبینی لە میدیادا، وەکو ئافرەتێك کۆسپ و ڕێگرییەکانی بەردەم کاری ڕاگەیاندن لە چیدا دەبینیتەوە؟**

**فائیزە عەلی:** لەئێستادا ئافرەتان وەکو هەموو بوارەکانی تری ژیان بەشداریێکی کاریگەر و ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە ڕاگەیاندندا، بەهۆی ئەو وردی و سەلیقە جوانەی کە هەیانە توانیویانە هەر سێ بواری بینراو، بیستراو و خوێندراو برازێننەوە، بەتایبەت لە خستنەڕووی بابەتەکانی تایبەت بەئافرەتان، چونکە خۆیان باشتر دەتوانن دەربڕی هەست و خەم و خولیا و حەز و پێداویستی و ئازار و تواناکانی خۆیان بن. سەرەڕای بەشداری کارایان لە بواری

> **ئافرەتان خۆیان باشتر دەتوانن دەربڕی هەست و خەم و خولیا و حەز و پێداویستی و ئازار و تواناکانی خۆیان بن، سەرەڕای بەشداری کارایان لە بواری سیاسی و بوارەکانی تر کە پێویستی بە هاندان و کرانەوەی دەرگای ترە**

سیاسی و بوارەکانی تر کە پێویستی بە هاندان و کرانەوەی دەرگای ترە بە ڕوویاندا. بێ گومان ئەم ئاستەی ئێستای کاری ئافرەت هەروا بە ئاسانی بەرهەم نەهاتووە, بەڵکو چەندین گرفت و ڕێگر هەن، کە زۆر جار ڕاگەیاندنکار بەگشتی سارد دەکاتەوە و دەبێتە لەمپەر لەبەردەمیدا, ئەگەر باسی ڕێگری بەردەم کاری ئافرەتان بکەین لە سەرووی هەموویانەوە ناهۆشیاری بەشێك لە خێزانەکانە بەرامبەر کاری ئافرەت لە ڕاگەیاندندا، کە ئەمەش بەشێکی بۆ کولتووری کۆمەڵگە دەگەڕێتەوە بەجۆرێك بەلایانەوە ئاساییە کار لە هەر بوارێکی تر بکات، بەڵام لە ڕاگەیاندن ئاسایی نییە, بەشێکیشی بۆ خودی ئافرەتان خۆیان دەگەڕێتەوە کە نەیانتوانیوە هاوسەنگی درووست بکەن لەنێوان ئەرکی ماڵ و دەرەوە و نەشیانتوانیوە متمانەیەکی تەواو بەدەست بێنن بەرامبەر خێزانەکانیان. سەرەڕای ئەمانەش ئافرەتان دەبێ بتوانن خۆیان بسەلمێنن بە خستنەڕووی ئەو توانایانەی کە هەیانە, خۆیان بەرەو پێش ببەن، نەك چاوەڕێی کەسانی تر بکەن.

**پەیامی ڕاستی: کاتەکانت چۆن بەسەر دەبەیت؟ لەگەڵ خوێندنەوە چۆنیت و لە چ بوارێکدا زێتر دەخوێنییەوە؟ پێتوایە خوێندنەوە و**

**خۆڕۆشنبیرکردن چەندە پێویستە بۆ میدیاکار بەگشتی و بێژەر بەتایبەتی؟**

**فائیزە عەلی:** لەدەرەوەی کاری ڕاگەیاندن کاتەکانم بەگوتنەوەی وانە و پەروەردەکرنی قوتابییان بەسەردەبەم. سەرەڕای خوێندنەوە کە زۆر حەزم لێیەتی، هەوڵم داوە لە هەموو بوارەکاندا بخوێنمەوە، بەتایبەتی بواری سیاسی، چونکە ئەم بوارە کاری ڕۆژانەی منە و پێویستم پێیەتی، خوێندنەوەی کتێب بۆ هەموو کەسێك گرنکە و ئاسۆی بیرکرنەوەی مرۆڤەکان فراوان دەکات, جۆریك لە هیوا و ئاواتت بۆ ژیان پێ دەبەخشێ. خۆڕۆشنبیرکردن بۆ میدیاکار بە گشتی و بێژەر بەتایبەتی زۆر پێویستە ڕۆژانە دەبێ لەگەڵ ڕوداوەکاندا بێت و ئاگاداریان بێت، چونکە هەبوونی زانیاری و خوێندنەوە زیاتر یارمەتی بێژەر دەدات بەخستنەڕوو و پێشکەشکردنی هەواڵ بەباشترین شێوە و وات لێ دەکات بچیە قوڵایی ڕووداوەکە, کەئەمەش کاری سەرەکیی بێژەرە.

**پەیامی ڕاستی: پێت وایە دەستکەوتنی شوهرەت و نازناو و شارەزایی لەو بوارە لەوەیە بێژەر لە چەند کەناڵێکی فەزایی درێژەی بە کاروانی ڕاگەیاندنی دابێت یان دەتوانێت لەکەناڵێکیش بێت ئەمە بەدەست بێنێت؟**

**فائیزە عەلی:** هەرچەندە دەستکەوتنی شوهرەت و ناوبانگ شتێکە لە ژیاندا مرۆڤەکان حەزی لێ دەکەن، بەڵام مەرج نییە بێژەر بۆ بەدەستهێنانی ئەمانە لە چەند کەناڵێك خزمەتی کردبێت، بەڵکو بێژەر دەتوانێ هەر لەیەك کەناڵیش کار بکات و ئەمانەش هەمووی بەدەست بینێ، بەمەرجێ کار لەسەر خۆی و بونیاتنانی بکات و شتی باش پێشکەش بکات و کار لەسەر تواناکانی خۆی بکات.

**پەیامیَ ڕاستی: سالأنێکە لە کەناڵی سپێدە کار دەکەی لە ئێستادا خۆت لە چ ئاستێکدا دەبینی؟**

**فائیزە عەلی:** جێگای شانازیمە کە هەر لە سەرەتای دامەزراندنی کەناڵی سپێدەوە لەم کەناڵە کار دەکەم، لە ئێستادا خۆم لە ئاستێکی باش دەبینم, لەگەڵ ئەوەشدا هەردەم هەوڵی بەرەوپێشچوون دەدەم، چونکە مرۆڤ هەر چەند شارەزایی هەبێ لەبوارێك هێشتا کەسانی تر هەن کە لەو شارەزاتر و باشتر بن، بۆیە هەردەم دەبێ لە هەوڵدابێ بۆ باشتر و باشترین.

**پەیامی ڕاستی: سپێدە چی بەتۆ بەخشیوە؟**

**فائیزە عەلی:** سپێدە ماڵی دووەمی منە و زۆر خۆشم دەوێ, بەجۆرێك ئاوێتەی بووم ناتوانم دەستبەرداری بم، چونکە ڕێز و خۆشەویستی و سەبر و خۆڕاگری و خزمەتکردنی خەڵکی پێ بەخشیوم.

**پەیامی ڕاستی: چ خەون و خولیایەکت هەیە لە بواری ڕاگەیاندندا تا ئێستا نەهاتووەتەدی؟**

**فائیزە عەلی:** سوپاس بۆ خوا کە هەموو خولیا و ئاواتەکانم هاتوونەتە دی.

**پەیامی ڕاستی:چیدی؟**

**فائیزە عەلی:** سوپاس و ڕێز و خۆشەویستیم هەیە بۆ هەموو خوشك و براکانم لە سپێدە و خۆشەویستیم بۆ هەموو بینەرانی سپێدە و ئێوەی بەڕێز.

## د. ئەبولقاسم فەنایی:

# عەدالەت لە نێو بۆتەی ئەسڵی ئایندایە نەک لەنێو فەرعی ئایندا

نووسەر و لێکۆڵەری ئێرانی، دکتۆر ئەبولقاسم فەنایی، زانا و ئەکادیمستێکی ئاینییە و پسپۆڕێتی لە هەردوو بواری فەلسەفە و فیقهدا هەیە، خاوەنی سێ کتێبە فەلسەفەی ئەخلاق لەسەدەی بیستدا، (وەرگێڕان 2002ز
دین لە تەرازووی ئەخلاقدا.. لەمەڕ جیاوازی نێوان ئەخلاقی دینی و ئەخلاقی سیکۆلار(2005 ز.
ئەخلاقی دیناسی.. لێکۆڵینەوەیەک لە سەر بنەمای مەعریفە و ئەخلاقی فیقهی (2011)ز.

**دیمانە: مەولود بەهرامیان.............. و لە فارسییەوە: حسەین سەید ئەدهەم**

بەهرامیان: یەکێك لەو چەمكانەی هەمیشە لەگەڵ مرۆڤدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە عەدالەتە، بفەرموو گوزەرێکی مێژوویی بەو چەمکەدا بکە و ڕوونی بکەوە؟

فەنایی: هەرچەندە لەبارەی ڕەوتی مێژووی عەدالەتەوە خوێندنەوەیەکی تایبەتیم نییە و نەکردووە، بۆیە لەوانەیە نەتوانم بە ئەندازەی پێویست مافی پرسیارەکە بدەم، بەڵام لەجیاتی ئەم پرسیارە دەکرێ ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بکەم، کە پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە ئەویش تیۆریایەکی (جۆن راولز)ە لەبارەی عەدالەتەوە، هەرچەندە تایبەت نییە بەخودی چەمکەکەوە،بەڵکودەگشتێنرێت بەسەر تەواوی چەمکەکەدا، بەشێوەیەکی گشتی ئەمەیە کە: وێنایەکی تەسکی عەدالەت جیاوازە لە تەفسیری وێنایەکی بەرفراوانتر بۆ چەمکەکە، ئێمە بە سروشت خاوەنی عەدالەتین، چەمکی عەدالەتیش جێگیرە و



کۆی مرۆڤایەتی وێنا و تێگەیشتنێکی هاوبەشی هەیە بۆ عەدالەت، لەکاتێکدا تەفسیری جیاواز بەدی دەکەیت لە سروشتی چەمکەکەدا.

لــــــە بنەڕەتدائەگــــــەری گفتوگۆکردن لەمـەڕ عەدالـەت بەتـەواوەتی خـۆی لـەنێو ئـەو بارنەیـەدا دەبینێتـەوە کـە ئـەو لایەنانـەی قسـە لـەم چـەمکە دەکەن پێویستە تێگەیشتنێکی هاوبەشیان هەبێت بۆ عەدالەت، هـەر لـە سـەر ئـەو بنەمایـە هــەمووان دەســتەواژەی عەدالەت یان دەرئەنجامەکـەی بە زمان و شێوازێکی تـر و بـۆ ئاماژەدان بە بابەتێکی دیاری کـراو یـان واتایـەکی هاوتـا بەکاری بهێنن، بـەردەوام لـەم شێوە و حاڵەتـەدا شـتێکی تـر هەیە پێی دەگوترێت: وشـەی هاوبەش، بـەم پێیـە عەدالـەت زیاتر لە واتایەك دەگرێتە خۆ و هـەر کەسـێکیش بـەر ویسـتی خـۆی واتایـەك بـۆ خـۆی هەڵدەبژێرێت

نموونەیــەکی ڕوون و بەرجەسـتە، پرسـیاری تـۆ لەسـەر عەدالـەت و وەڵامـی منیش بەم شـێوەی ئێسـتایە، واتە پرسیاری تۆ لەسەر شتێك بوو وەڵامی منیش شتێکی تر، کە لەواقیعدا وا نییە، لەوانەیـە بـە ڕووکـەش وا بێـت، بـەڵام دڵنیاییەکی کورتی هاوبەشمان هەیـە بـۆ عەدالـەت، دەشـێ لەسـەر وێنایـەکی بـەرفراوان و لەسـەر عەدالـەت جیـاوازی بۆچوونمان هەبێت، دەبینین لە ئەنجامـدا گفتوگـۆی لەسـەر دەکەین، بەم پێیە واتای وێنای کـورتی عەدالـەت سـەرەتای هەیـە، بـەڵام مێـژووی نییـە، ئـەوەی خـاوەنی مێـژووە تەفسـیر و وێنـای بـەرفراوانی عەدالەت و پێناسەی فەلسەفە و بنەمای عەدالەتە، وەك ڕاوڵز هەندێك جار بەکاری دەهێنێت

دەتوانم بانگەشەی ئەوە بکـەم کـە مـرۆڤ بەدرێـژایی مێـژوو تەفسـیری جیـاوازی هـەبووە لەسـەر عەدالـەت، تەنانــەت فەیلەسـووف و بیریارانی مـەزنیش پێناسـەی جۆراوجـۆری فەلسـەفییان بەدەست هێناوە لەسەر ئـەم چەمکە

> عەدالەت بەشێك نییە لە بەها ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکان بەڵکو لەوان باڵاترە و یەکێکە لە بەهاکانی ئەخلاقی تاکەکەسی و بەهای ئەخلاق باوەڕی

بەهرامیان: دیارە کە عەدالەت لــە ئەندێشــەی دینیــدا فـەرمانێکی یەزدانییـە، ئایـا عەدالـەتی سـەردەمی مۆدێرن تاچەند لەگەڵیدایە و تەبایە؟

فەنایی: لـەنێو ئاینەکانـدا و دەربارەی عەدالەت زانیـاری و تایبەتمەنـدی فـراوانم نییـە، بـەڵام بەگشـتی قسـە لەسـەر عەدالەت دەکەین لـە ئیسـلام، ئەوەنـدەی مـن بـزانم ئیسـلام پێناسـە و تەفسـیرێکی نـوێی نەهێناوە بۆ ئیسلام، بەڵام واتا و تەفسـیرێکی هێنـاوە کـە بەشـێکە لـە عـەقڵی سـەلیم، لەلایـەکی تریشـەوە چاکە و فەزیلەتی عەدالەت بە کـارێکی ئـەخلاقی دەزانێـت، هاوکـات ئامۆژگـاری شـوێنکەوتووانی دەکـات بـە پابەنـدبوون بەعەدالەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لەسـەر بنـەمای بیروبـاوەڕ و پەروەردەی دینییەوە گرەنتی بەڕێوەچوونی بـەهێز دەکـات، هـەروەها عەدالـەت لـە نێـو بۆتەی ئەسڵی ئایندایە نەك لە نێـو فـەرعی ئاینـدا، بـەڵکو بنەمای بنەماکانی ئاینە، واتـە ئەسـڵ و فـەرعی ئـاین بنەمایـەکی سـەر و ئاینیی هەیە. عەدالەت بەشێك نییە لە بــەها ئــەخلاقی و

**عەدالەت گرەنتی جێبەجێکردنی یەکسانییە، بەڵام یەکسانی مامەڵەیەکی ئەخلاقییانەیە**

کۆمەڵایەتییەکان، بەڵکو لەوان بالاترە و یەکێکە لە بەهاکانی ئەخلاقی تاکە کەسی و بەهای ئەخلاق باوەڕی

بەهرامیان: ئایا عەدالەت زامنی یەکسانییە، ئایا ئەم دوو چەمکە لە واتادا هاوتای یەکترین، ئەی بوونی یەکێکیان ئەوی تر دەسەلمێنێ و ماف دەداتێ یان نا؟

فەنایی: پرسیارێکی گرنگ و بەجێیە، زۆرینەی خەڵکی لەو بڕوادایە عەدالەت واتە یەکسانی، واتە ئەگەر ئەم دوو چەمکە وەکو یەك نەبێ ئەوا تەواوکەری یەکترن، بۆیە ئەگەر پێوەرێك نەبێت بۆ جیاکردنەوەی واتای نێوانیان ئەوا یان واتایان لای خەڵکی تێکەڵ دەبێت یان واتایەك هەردوو وشەکە دادەپۆشێت هەندێ کات عەدالەت خوازیاری ڕەفتارێکی جیاواز ئامێز و نایەکسانە، هەروەها مامەڵەیەکی یەکسانانەیە لەگەڵ بەشێك یان هەندێك شت نەك بەتێکڕایی گشتیی، دەتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین کە عەدالەت گرەنتی جێبەجێکردنی یەکسانیشە، بەڵام یەکسانی مامەڵەیەکی ئەخلاقیانەیە، بۆیە عەدالەت بە یەك چاو سەیر کردن نییە بۆ تێکڕا، بەڵکو بە واتای بەیەك چاو سەیر کردنی تێکڕایە یان کۆی شتەکان

بەهرامیان: بۆ ئەوەی کۆمەڵگا لە ڕێڕەوی بەختەوەریدا بێت و لە هەناویدا بژیت، ئایا جێبەجێ کردنی عەدالەت بەسە یاخود بوونی تەنیا مەرجێکی پێویستە؟

فەنایی: لەدیدی ئەو ئاینانەی کە باوەڕیان بە ژیانی پاش مەرگ هەیە بەختەوەری دوو بەشە، یەکێکیان لەم دونیایەدا و ئەوتریشیان لەدواڕۆژدا، عەدالەتیش بە دوو واتایە یەکێکیان تاکەکەس و ئەوی تریان گشتییە، لێرەوە دەبێت بزانرێت خۆشبەختی هەردوو دنیا چۆن پێناسە بکرێن ئەوسا وەڵام و دەرەنجام جیاواز دەبێت بەوەی کە ئایا عەدالەت لە بۆتەی مەرجی بەختەوەری دایە یان نا، ئەگەر ئەرێنی بێت یان مەرجی پێویست بێت ئەوە شتێکی ترە

عەدالەتی کۆمەڵایەتی یەکێکە لە بەشەکانی خۆشبەختی دونیایی، واتە ئەگەر هاووڵاتی لە کۆمەڵگایەکی دادپەروەریدا بژی ئەوە خۆشبەختی ئەم دونیایە، لەلایەکی تریشەوە عەدالەت بۆ خۆشبەختی ئەم دونیایە مەرجێکی پێویستە، بەڵام عەدالەتی تاکە کەسی بەستراوە بە خۆشبەختی ئەو دونیاوە، عەدالەتی کۆمەڵایەتی بۆ خۆشبەختی دواڕۆژی تاك هیچ ڕۆڵێکی ڕاستەوخۆی نییە تێیدا، واتە لەخۆشبەختی دواڕۆژدا تاك لە کۆمەڵگایەکدا نییە کە کۆمەڵگاکەی دادپەروەر بن، بەڵام بەمەرجێك کە لە ستەمی کۆمەڵایەتیدا هیچ ڕۆڵێکی نەبووبێت و ڕۆڵی نەبێت بۆ لابردنی ئەو ستەمە

سەرچاوە
پێگەی: www.eslahe.com



# عیشق، ڕۆحی دین و دەستکەلای ژینە

## (عیشق، بە زمانی سادە و بێ پێچ و پەنا لەگەڵمان دەدوێ)

مودریك عەلی عارف

### دەسپێك:

چەمك و بابەتێکی زۆر گرنگ و پێویست و ئێجگار جوان و بەسود و بەچێژ. کە سودی جیاواز و ڕەنگی پەلکە زێڕینەیی و چێژی فراوان بە دین و ژینی مرۆڤەکان دەبەخشێ و ڕۆح دەبەخشێتەوە بە دینداری دینداران. چەمك و بابەتێك کە ڕۆح ناسك دەکاتەوە و دڵ فراوان دەکات و دەیبووژێنێتەوە. بابەتێك کە ڕۆح دەخاتە پەرواز و لە ئاسمانی مەعنەوییەتدا لە شەقەی باڵ دەدات و دڵ دەخاتە سەماکردن و حاڵ و جەزبەوە. بریتییە لە چەمك و بابەتی عیشق و خۆشەویستی.

لەبەر ئەو چەند تایبەتمەندی و خەسڵەتانەی سەرەوە و چەندانی دیکەیە. کە چەمك و بابەتی عیشق و خۆشەویستی مشتومڕێکی زۆر و فراوانی لەسەرە و چەندین ڕا و بۆچوونی جیاوازی لەبارەوە هەیە. مشتومڕ لەسەر پێناسە و ناساندنی.. لەسەر جێکەوت و کاریگەرییەکانی.. لەسەر ئەرك و بەرپرسیارێتییەکانی.. لەسەر سیما و چۆنیەتی جیلوەکردنی لە ژیانی ڕۆژانە و لە ناو بەندایەتی و خواپەرستییەکانی دینداراندا.. لەسەر ماهییەت و تواناکانی.. لەسەر بەدیهێنەر و بەخشەرەکەی وهتد... کە هەموو ئەمانە گرنگی و پێویستی ئەم چەمك و بابەتە دەردەخەن بۆ مرۆڤەکان بەگشتی و نیشانی دەدەن کە ئەم شتە پێویستییەکی حاشاهەڵنەگری ژیانی تاکەکانە. سەرمایەیەکی گرانبەها و گەنجینەیەکی دانسقەیە.

## عیشق یانی چی و جێگەوتەکانی چین؟

بەشێك لەو مشتومڕەی کە لەسەر چەمکی (عیشق) ئەنجام دەدرێ، بریتییە لەوەی کە نابێ وشەی عیشق بەکار بهێنرێ و بە وشەیەکی بڤە و یاساغ هەژمار دەکرێ، هەندێ جاریش بە خراپ دەزانرێ و بەو چەشنە لێی تێگەیشتوون کە ئەم وشەیە تەنها بۆ پەیوەندی نامەشروع و نارەوا و خۆشەویستی و حەز لەیەکترکردنی نێوان ڕەگەزی نێر و مێ بەکاردێت، بۆیە وتوویانە شایستە نییە کە بۆ پەیوەندی و خۆشویستی ڕەوا و دروست یان بۆ پەیوەندی و خۆشەویستی نێوان خوا و بەندە بەکار ببرێ، ئەمەش بەبێ هیچ بەڵگە و پاساوێکی لۆژیکی و بێ ئەوەی لە ناوەڕۆکی وشەکە و تەنانەت لە چاوگ و ڕیشەی زمانەوانی وشەکە تێگەیشتبن و هیچ دەقێکی شەرعی لەبەردەستیاندابێ بۆ بە حەرام زانینی یان بە خراپ زانینی.

عیشق لە کتێبە زمانەوانییەکاندا بە مانای (خۆشەویستی زۆر و تایبەت هاتووە.) و وەك یەکێك لە قۆناغەکانی خۆشەویستی ناو براوە، ئیدی ئەو عیشقە لە خواناسی و خواپەرستی و چاکەدا بەکار ببرێ، یان بۆ پەیوەندی نێوان دوو یان چەند کەسێك، یاخود لە پێناو هەوا و هەوەس و ئارەزوو و بۆ ڕەگەزی بەرامبەر و هەر شتێکی دیکە، هەندێکیش بڕوایان وایە و دەڵێن: لە سەرەتادا چاوگی ئەم وشەیە لە (عشقە)ەوە

**ئەڵبەتە تەنها کەسێك دەتوانێ لە عیشق و خۆشەویستی بگات، کە عاشق بوو بێت و چەشتبێتی**

وەرگیراوە، کە بریتییە لە گیایەك کە دەپێچرێت لە دار و درەخت و لاواز و وشکیان دەکات و خۆی بە ناسکی و گەشاوەیی دەمێنێتەوە، کە بە فارسی پێی دەڵێن (پیچك) و لە کوردیشدا پێی دەوترێ (لاولاو) کە خۆی هەڵدەزنێ بە دار و دیواردا و هەر دوو جۆری ناو ماڵ و دەشت و بیابانی هەیە، کە گوڵی جوان و ڕەنگی جیاوازی هەیە و زیاتر بۆ ڕازاندنەوەی حەوشەی ناو ماڵ دەنێژرێ، بە هەمان شێوە عیشقیش خۆی هەڵدەواسێ و خۆی دەپێچێ لە دڵی مرۆڤی عاشق و دایدەڕنێ و وشکی دەکاتەوە لە حەز و ئارەزووە ماددییەکان، پەیوەستی دەکات بە ناسکی و جوانییە مەعنەوییەکانی خۆشەویست و مەحبوب و مەعشوقەکەیەوە.

عیشق و خۆشەویستی یەکێکە لە ڕەگەزە سەرەکی و کاریگەرە مەعنەوی و ئەخلاقییەکان لەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤەکان، کە وا دەکات لە مرۆڤی عاشق ئەخلاقیانە و مەعنەوییانە مامەڵە لەگەڵ خوا و خەڵك و خۆی و سروشتدا بکات و خۆشی بوێن و پەیوەست ببێت پێیانەوە و ئامادەبێت خۆی بکاتە قوربانی مەحبوب و مەعشوقەکەی.

وەك (ئیبنولقەییمی جەوزی) لە کتێبی (مدارج السالكين)دا دەڵێ: (عیشق یەکێکە لە دە قۆناغەکەی مەحەببەت.) عیشق وشەیەکە و لەبەرامبەر ئەو هەستە زۆرەی دڵەوە بەکار دەبرێ کە کەسێك کەمەندکێشی کەس و زاتێکی دیکە دەبێ، یەکێکە لە کۆتا قۆناغەکانی مەحەببەت و خۆشەویستی، عیشق ئاگرێکە بەر دەبێتە دڵی کەسی عاشق و ئەویندار و هەرچی شتێکی دیکە کە لە دڵیدایە دەیسوتێنێ بێجگە لە مەحبوب و مەعشوقەکەی، عیشق و خۆشەویستی بۆ کەسی خواناسیش شۆڵەیەکی بڵێسەدارە لە دڵی کەسی عابیدی خوادۆستدا، کە هەرچی لە دڵیدایە هەڵیدەپرووزێنێ و دەیسوتێنێ و دەیکاتە قەرەبووت و خۆڵەمێش، لەپێناوی بەدەستهێنان و توانەوە لە ناو عیشق و خۆشەویستی و ڕەزامەندی خوادا.

ئەڵبەتە تەنها کەسێك دەتوانێ لە عیشق و خۆشەویستی بگات،

کە عاشق بوویێت و چەشتبێتی، عیشق وەك چێژ و تام و ئازاری ژانی منالبوونە بۆ دایك، چونکە ئەگەر دایکێك هەزار جار باسی ئەو ئازار و چێژەی کاتی منالبوونی خۆی بۆ کچێك یان ژنێك بکات کە هێشتا منالی نەبووبێ، قەت لێی تێناگات و هەستی پێ ناکات، بەلکو تەنها زانیاری پێ دەبەخشێ و جێکەوتەکانی نیشان دەدات نەك خودی ئازار و چێژەکە... واتە عیشق ئازار و تامێکە دەبێ بچەژرێ و بیچەژی، تەنها بە باسکردن و بینینی جێکەوت و کاریگەرییەکانی لێی تێناگەیت، کەسێك تامی سوێری نەچەشتبێ، سەد سال باسی سوێری خوێی بۆ بکە لێی تێناگات و هیچ جیاوازییەکی بۆ ئەو نابێ لە گەل تامی شەکر یان ژالەدا، کەسێك نەسوتابێ نازانێ ئازاری سوتان چۆن و چەنێکە، وەك هونەرمەندی دەنگ زولال (بەهجەت یەحیا) لە کۆپلەیەکی گۆرانی (هاواری ویژدان)دا دەلێ:

**نازانن کە هاواری من، گۆرانییە**
**و لای لایەیە**
**ئەوەی نەیدیبێ نازانێ، عەشق**
**چ ژانێکی هەیە**

هەروەك لە کۆپلەیەکی گۆرانی (ڕێگەی عاشقان)یشدا باس لە سوتانی دل و توانەوە و فەنابوونی سەرتا پای عاشق دەکات لە پێناو گەیشتن بە مەعشوقدا و دەلێ:

**تا دل نەسوتێ دەم بە دەم،**
**فانی نەبێ سەر تا قەدەم**
**پەروانە قەت ناگاتە شەم، ئاوایە**
**ڕێگەی عاشقان.**

بە هەمان شێوە (سەنایی) شاعیریش زۆر جوان ئەم حالە و باسی هاتنی عیشق و سوتانی دلەمان بۆ بەیان دەکات و دەلێ:

**أی بی خبر أز سوخته و**
**سوختنی**
**عشق آمدنی بود، نه آموختنی.**

واتە: ئەی کەسێك کە بێ ئاگایت لە کەسی سوتاو و خودی سوتان، ئەوە بزانە کە عیشق خۆی دێت و بە بێ پرس خۆی دەکات بە مالی دلی کەسی عاشقدا، نەك شتێك بێ بتەوێ فێری ببیت، ئەوە زانست نییە تا فێری ببیت، ئەوە سوتانە دەبێ بسوتێی و بیچەژی.

هەر ئەمەش وای کردووە هەندێك بڕوایان وایە کە (عیشق و خۆشەویستی) پێناسە ناکرێ، بەلکو تەنها دەتوانرێ باس بکرێ، باسی تام و چێژ و ژان و ئازار و جێکەوت و کاریگەرییەکانی، بۆیە ئێمەش ناچار پەنا دەبەینە بەر ئەم دوو بەیتە شیعرەی (مەولانا جەلالەدینی مەولەوی) کە دەلێ:

**هرچه گویم عشق را شرح و بیان**
**چون به عشق آیم خجل باشم از**
**آن**
**گر چه تفسیر زبان، روشنگر**
**است**
**لیك عشق بی زبان، روشنتر**
**است.**

واتە: هەرچی و هەر چەنێك لەبارەی عیشقەوە بدوێم و شرۆڤە و مانای بکەم هەر کەم و ناتەواوە، چونکە کاتێك کە بە خودی عیشق بگەم، لە بێ توانایی و دەستەوسانیدا خەجالەت و شەرم دەمگرێ لە ئاستیدا، ئەگەرچی ڕاڤە و ماناکردنی زمان بۆ عیشق ڕۆشنکەرەوەیە بۆی، بەلام عیشقی بێ زمان ڕونترە.

## گەنج و عیشق، یان عیشق گە نجینەی گەنج

ئەم چەمکە بە شێوەیەك جێی بایەخ و گرنگی پێدانی هەموانە بەگشتی و لاوان بەتایبەتی، کە زۆر جار بە دونیایەك پرسیار و گرێ و تێبینی ئالۆزەوە خۆی دەکات بە مالی دل و زەینیاندا و ناچاریان دەکات کە بگەڕێن بە شوێن وەلامەکانیاندا، پرسیارگەلێکی هاوشێوەی ئەم پرسیارانەی خوارەوەیان ڕووبەڕوو دەکاتەوە:

> عیشق و خۆشەویستی وزە و توانا و هێزێکی بێ وێنە بە مرۆڤی عاشق و ئەویندار دەبەخشێ، بە چەشنێك کە سەرنجی خەلکی بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و کەمەندکێشیان دەکات، لە ئاست

عیشق و خۆشەویستی یانی چی و چۆنە؟ کێ بەدیهێنەریەتی و کێ دەیبەخشێ؟ پێوەرەکانی کامانەن؟ جێکەوتەکانی چین و چۆنن؟ ڕێگەکانی دەستگەیشتن بە عیشق و خۆشەویستی کامانەن؟ ئەی چۆن دەتوانین عیشق و خۆشەویستی لە ناخماندا زیاد بکەین؟ ڕۆڵی عیشق و خۆشەویستی لە پەروەردەکردنی مرۆڤ و پاککردنەوەی دڵ و گەشەپێدانی ڕۆحدا چییە؟ ئایا عیشق و خۆشەویستی دەتوانێ مرۆڤ بگەیەنێت بە کەماڵ یان نزیکی بخاتەوە لێی؟ مەعشوق و مەحبوبی ئێمە کێیە و دەبێ کێ بێ؟ قورئان چۆن دەڕوانێتە خۆشەویستی و عیشق؟ ئەمانە و چەندین پرسیاری دیکە، کە پێویستە مرۆڤ بگەڕێ بەدوای وەڵامەکانیاندا، بۆ ئەوەی سود و چێژ لە ژین و دینی ببات و دونیا و دوارۆژی لێوانلێو بکات لە چێژ و خۆشی.

بە بڕوای بەندە و بە سەرنجدانم لە ناو خەڵکی و بەدواداچوونی چەند ساڵە و خاکیانەم لەسەر ئەم پرس و بابەتە، تینووترین و تامەزرۆترین کەسی خوازیاری ئەم چەمك و بابەتە زەریف و ناسکەش، گەنجانی دڵ ناسك و لاوانی دڵزیندوون، بۆیە دەبینین کە چۆن هەمیشە و بەردەوام وێڵ و عەوداڵن بە شوێنیدا و دەیانەوێ لە هەر جێیەك و بە هەر شێوەیەك بووە ئەم (ئیکسیر) و (کیمیا) نایاب و کەمیاب و دەگمەنە دەستبخەن، بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییەی ناو دڵیانی پێ پڕ بکەنەوە، بۆیە دەبینین کە لە هەر شوێنێك و لە هەر کاتێکدا و لە لایەن هەر کەسێکەوە باسێکی عیشق و خۆشەویستی بکرێ یان دیمەنێکی لێ نیشان بدرێ و دەرکەوێ، یاخود بەشێوەیەك لە شێوەکان عیشق خۆی جیلوە بکات، کەسانی گەنج و لاو زۆرترین بیسەر و بینەر و خوێنەری تامەزرۆی دەبن، بە عیشوە و ناز و تامەزرۆییەوە پێشوازی لێ دەکەن و هەڵوێستەی جددی لە سەر دیمەن و قسە و بۆچوون و کاریگەرییەکانی دەکەن.

## کاریگەری عیشق، ستەمێك لێی کراوە

بەڵام مەخابن کە هەنێ جار ڕوخسار و ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی ئەم چەمك و بابەتە مەعنەوی و ڕۆحییە گرنگە وەك خۆی نەناسراوە و نەناسێنراوە و نەبینراوە، جارێ لە لایەن هەندێکەوە نەزانانە و کاڵفامانە وێنە جوان و حەقیقییەکەی دەشێوێنرێ.. تاوێکیش بێ ویژدانانە ڕۆحی پاکی ناوەڕۆکەکەی دەکوژن و لە گۆڕستانی بێ مرووەتیدا ئەسپەردە دەکرێ... هەنێ جاریش ستەمکارانە دەکرێتە دێوەزمە و شتێکی قێزەون و بێزراو، یان لەوانە خراپتر بە بەلا و کۆسپی ژیان و تەنانەت دژی ئایین و خواناسی دەزانرێ و ڕێژنەی فتوای حەرامی بەسەردا دابەش دەکرێ، کە تەواو پێچەوانەیە لەگەڵ حەقیقەت و ماهییەتی ئەم چەمکە گرنگ و جوانە و بەسەر خودی ڕۆحی دینیشدا.

عیشق و خۆشەویستی وەك (ئیکسیر) و (کیمیا)یە، وەك چۆن ماددەیەك دەگۆڕێ بە ماددەیەکی دیکە، مس و زیو دەکات بە زێڕ، بە هەمان شێوە عیشق و خۆشەویستیش ژیان دەگۆڕێ بە ژیانێکی دیکە.. دڵ دەگۆڕێ بە دڵێکی دیکە.. مرۆڤ دەگۆڕێ بە مرۆڤێکی دیکە.. گوفتار و ڕەفتار و بیرکردنەوە و تەنانەت خەون و خەیاڵەکانیشی دەگۆڕێ و دەیکاتە کەسێکی دیکە، دڵی ئەمدیو و ئەودیو پێدەکات و هەست و ویژدانی دەبزوێنێ و دەیخاتە جۆش و خرۆش، وەك شاعیر دەڵێ:

**از محبت تلخ ها شیرین شود**
**از محبت مس ها زرّین شود.**

واتە: بە هۆی عیشق و خۆشەویستییەوە، تاڵییەکان شیرین دەبن، هەروەها هەر بەهۆی ئیکسیری عیشق و خۆشەویستییەوە (مس)ەکان دەبن بە زێڕ.

عیشق و خۆشەویستی وزە و توانا و هێزێکی بێ وێنە بە مرۆڤی عاشق و ئەویندار دەبەخشێ، بە چەشنێك کە سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و کەمەندکێشیان دەکات، لە ئاست گوفتار و ڕەفتارەکانیدا بەچۆکدا دێن و دامەنگیری کەسی عاشق دەبن، وەك چۆن ئەمی عاشق دامەنگیر و گیرۆدەی مەعشوق و

مەحبوبەکەی بووە و دەبێ.

## عیشق و دین، عیشق لە کوێی دیندا جێی دەبێتەوە؟

ئەگەرچی خودی وشەی (عیشق) لە قورئاندا بەکار نەهاتووە، بەڵام چەندین وشەی هاوشێوەی بەکارهاتووە، کە ئەو چەمکانە مانای هاوشێوە یان کەمتر یاخود زیاتر و قوڵتر لەوە دەگەیەنن، وەك وشەکانی: (حُبّ) و (وِدّ) و (شَغَفْ) و (هَوَى) و هتد.. کە هەر یەکەیان قۆناغێکە لە قۆناغەکانی خۆشەویستی، ئەمە بێجگە لە چەندین وشە و چەمکی دیکە کە وشەی (عیشق) و خۆشەویستی لە ژێر سێبەری هەموویاندا دەبینرێ، لە چەشنی وشەکانی: (لُطف) و (رأْفَة) و (رَحْمَة) و (سَكِيْنَة) وهتد..، کە لەوانەیە ئێمە ـ وەك گریمانەیەك ـ بتوانین بڵێین بەکارنەهێنانی وشەی (عیشق)یش لە قورئاندا، لەبەر ئەوە بووبێ کە پێشتر و لە لایەن شاعیران و خەڵکی ئەوکاتەوە، ئەو چەمك و دەستەواژەیە تەنها بۆ کار و دیمەنی خراپ و ناڕەوا و پەیوەندی و دڵداری نامەشروعی نێوان دوو ڕەگەز یان بۆ شتی ماددی بەکار هاتبێ و ئەرکێکی غەیری ئەرکی خۆی پێ سپێردرابێ، یان لەبەر هەر حیکمەتێکی دیکە کە خوا خۆی زاناترینە پێی.

بە بڕوای بەندە مەرج نییە هەر وشەیەك یان چەمك و دەستەواژەیەك لە قورئاندا بەکار نەهاتبوو، ئەوە مانای خراپی و نەگونجاوی ئەو وشە و چەمکە بێت و دروست نەبێ ئێمەش بەکاری بهێنین، بۆیە ئەمە نابێتە گرفت و ڕێگر لەبەردەم ئەوەدا کە ئێمە ئەم وشەیە بەکار بهێنین و ئەرکە حەقیقییەکەی خۆی پێ بسپێرینەوە، کە بریتییە لە ڕۆح و وزە و چێژ و سود بەخشین بە ژیان و بەندایەتی و خواناسی و ڕۆچوون بەناو قوڵاییەکانی ڕۆحی دیندا، هەروەها بۆ ئەخلاقیانە و عاشقانە مامەڵەکردن لەگەڵ ژیان و زیندووکردنەوەی دڵ بە هەستی (مرۆڤدۆستی) و (ژیاندۆستی) لەناو تاکەکانی کۆمەڵگەدا، ئیدی گرنگ نییە ئەم ئەرك و حاڵەتە مەعنەوی و ڕۆحییە، ناوی (عیشق) بێت یان خۆشەویستی، ناوی ئەوین و دڵداری بێت یان شەیدایی، گرنگ ناوەڕۆکی شتەکەیە، وەك ڕێسا ئوسوڵییەکە دەڵێ: (**اَلْعِبْرَةُ لِلْمَقَاصِدِ وَالْمَعَانِي لاَ لِلْأَلْفَاظِ وَالْمَبَانِي.**) واتە: عیبرەت و تێگەیشتن بۆ مەبەست و ماناکانە، نەك وشە و دەربڕینەکان.

ئاشکرایە کە بەدیهێنەر و بەخشەری عیشق و خۆشەویستیش هەر خوای بەخشندە و میهرەبانە، وەك چۆن بەدیهێنەر و بەخشەری ڕۆح هەر خوایە و بەبێ جیاوازی بە هەموو مرۆڤەکانی بەخشیوە، عیشق و خۆشەویستیشی بە هەموو مرۆڤەکان بەخشیوە، بەڵام دواجار ئەوە مامەڵە و ڕەفتاری مرۆڤەکانە کە جیاوازە لەگەڵ ئەم خەڵات و بەخششەدا، کەسانێکیان هەن کە خزمەت و پەروەردەی دەکەن و گەشەی پێدەدەن و بەکاری دەهێنن، لەبەرامبەریشدا کەسانێکی نمەك نەناس و سپڵە و بێ وەفاش هەن کە دەیکوژن و لەناوی دەبەن، یاخود ڕوخساری دەشێوێنن و ئەرك و بەرپرسیارێتی خۆی لێ وەردەگرنەوە و نائەخلاقیانە و نائینسانیانە بەکاری دەهێنن و وەزیفەیەکی دیکەی نەگونجاوی پێدەبەخشن.

هەر لەو ڕوانگەیەوە و بە سەرنجدان و تێگەیشتنمان لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، دەتوانین بڵێین کە کرۆك و بناغە و پایەی سەرەکی هەموو ئایینە ئاسمانییەکانیش بریتی بووە لە عیشق و خۆشەویستی، بەتایبەت ئایینی ئیسلام، کە کۆتا پەیامی ئیلاهییە، بۆیە کاتێك تەماشای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەین، ئەو ڕاستییەمان زۆر بە جوانی بۆ دەردەکەوێ و دەبینین کە چەمك و بابەتی عیشق و خۆشەویستی، پانتاییەکی ئێجگار فراوانی لە مەسەلەی بیروباوەڕ و دینداری و خواناسیدا گرتووەتەوە، ئیدی ئەو بەشەی کە پەیوەندی بە نێوان مرۆڤەکان و خواوە هەیە، یان ئەوەی کە

پەیوەندی بە نێوان مامەڵەی مرۆڤەکانەوە هەیە لە نێوان خۆیاندا.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم بۆ دڵنیایی زیاتر و بەرچاوڕوونییەکی باشتر، هەندێك لەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز کە باسی خۆشەویستی و عیشق دەکەن، تەنها وەك نموونە بخەمە ڕوو:

﴿والذين آمنوا أشد حبا لله.﴾ و ﴿والذين تبوؤا الدار والأيمان من قبلهم يحبون من هاجر اليهم.﴾ و ﴿ان الله يحب التوابين و يحب المتطهرين.﴾ و ﴿والله يحب المحسنين.﴾ و ﴿ان الله يحب المتقين.﴾ و ﴿ان الله يحب المتطهرين.﴾ و ﴿ان الله يحب المقسطين.﴾ و ﴿وجعل بينكم مودة ورحمة.﴾ و ﴿ألله لطيف بعباده﴾ و ﴿ألله رؤوف بالعباد.﴾ وهتد..

لەبەر ئەوەی کە عیشق و خۆشەویستی ئەسڵێ وایە کە دوو لایەنە بێت، بۆیە خوای گەورە ڕوو دەکاتە بەندەکانی خۆی و پێیان دەفەرمووێ: ﴿يحبهم و يحبونه.﴾ و ﴿فسوف يأتي الله بقوم يحبهم ويحبونه.﴾ ئەڵبەتە بەشێکی زۆری ئەم خۆشەویستییەشی پەیوەست کردووە بە شوێنکەوتن و پەیڕەوی کردنی فەرموودە و ڕێنومایییەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەك دەفەرمووێ: ﴿قُلْ اِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ.﴾ بۆیە بەوپەڕی جورئەتەوە دەتوانین بڵێین کە: بەندایەتی و خواپەرستی و نوێژ و دوعا و نزا کردن، لوتکەی عاشقی و عیشق نواندن و دڵداری کردنە، دەربڕینی ئەو پەڕی خۆشەویستییە بەرامبەر خوای مەعبودی مەحبوبی مەعشوقی میهرەبان و بەسۆز.

## چۆن عیشق و خۆشەویستیمان زیاد بکەین؟

ڕێگەکانی زیادکردنی عیشق و خۆشەویستی زۆرن، وەك ساغکردنەوەی نییەت و دڵسافی و نەبوونی ڕق و کینە و ئیرەیی بردن و نەهێشتن و کەمکرنەوەی توڕەیی و هەڵچوون و هتد..، بەڵام باشترین ڕێگە بۆ زیادکردنی عیشق و خۆشەویستی، بوونی مەعریفەیە، مەعریفە و ناسین بەرامبەر بە زاتی مەحبوب و ئەو کەسەی کە خۆشت دەوێ و دەتەوێ بیکەیتە مەعشوقی خۆت، بۆ ئەوەی ئامادەبیت لەبەرامبەریدا سەری ڕێز دانەوێنی، بۆ ئەوەی دڵتی پێ ببەخشی، ئەوپەڕی ڕێزی لەبەرامبەردا بنوێنیێ، بە پاکی و ڕاستگۆیانە و بەو پەڕی عیشق و ئەوین و سۆزەوە و بە ئاسکی و لەخۆبردووییەوە مامەڵە و ڕاز و نیاز و دڵداری لەگەڵدا بکەیت، بیکەیتە مەعشوق و مەحبوبی هەمیشەییت و بتوێیتەوە بۆی، یان گڕ بگریت و بسوتێیت و باڵ بگریتەوە بۆ لیقا و دیداری، شەیدای جوانی و جەماڵ و کەماڵ و جەلال و چاکی و پاکییەکەی ببیت، بۆ ئەوەی چیدی بەدوی عیشقی ڕووکەش و ڕوکارەوە نەبیت، چونکە ئەو جۆرە عیشق و خۆشەویستییانە فانی و کاتی و لەناوچوون، لەوەش خراپتر ڕووزەردی و ڕیسوایی و ئابڕووچوونی دونیا و دواڕۆژیان لەدوایە، وەك (مەولانا جەلالەدینی مەولەوی) دەڵێ:

**عشقهای که ز پی رنگی بود**
**عشق نبود، عاقبت ننگی بود.**

واتە: ئەو عیشق و خۆشەویستییانەی کە هەر بەدوای ڕەنگ و ڕوخسار و ڕووکەشی شتەکانەوەن، ئەوانە عیشق و خۆشەویستی نین، بەڵکو ئەوانە سەرەنجام هەر نەنگی و سەرشۆڕی دەبن بۆ خاوەنەکانیان و ڕیسوایان دەکەن و کەسێتیيان لەکەدار دەکەن.

## عیشق چەند جۆرە؟ یان چۆن پۆلێن دەکرێ؟

بەندە چەندین جاری دیکە و لە نووسین و کۆڕ و وانەی تایبەتدا، ئەوەم خستووەتە ڕوو کە بڕوام بەو پۆلێنکردنە نییە کە عیشقی زەمینی و ئاسمانی.. ئیلاهی و ئینسانی.. حەقیقی و مەجازی هەبێت، بەڵکو عیشق و خۆشەویستی هەمووی هەر یەك عیشقە و ڕەببانی و ئاسمانییە و خەڵاتی خوایە، وەك چۆن ڕۆح لەلایەن خواوەیە و تەنها ئەو دەیبەخشێت، بە چەندین نموونە و شێواز ئەو بۆچوونانەشم ڕوون

کردووەتەوە.
ئەمجارەش بۆ ئەم بابەتە، پۆلێنکردنێکی دیکە دەخەمە ڕوو بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن و بەکارهێنانی چەمك و بابەتی عیشق و خۆشەویستی، کە وەك ماددەیەکی خاو و (قوڕی دەستکرد) وایە و دەکرێ و دەتوانی بۆ هەر یەکێك لەم کەس و حاڵەتانە و بە چەشنێکی جیاواز بەکاری بهێنی:

1ـ عیشقێك کە لەسەرەوە بۆ خوارەوەیە، وەك عیشقی دایك و باوك بۆ منداڵەکانیان، بەرپرس و فەرمانڕەوا و پێشەوا بۆ جەماوەر و ژێر دەستەکانی، گەورە و سەرکردە و بەرپرس دەبێ بە چاوی باوك و دایکی بەسۆز و میهرەبان و پەرۆشەوە بڕوانێتە گەل و ژێردەستەکانی.

2ـ عیشقێك کە لە خوارەوە بۆ سەرەوەیە، وەك عیشقی منداڵ بۆ دایك و باوکی، یان جەماوەر و هاوڵاتی بۆ بەرپرس و فەرمانڕەوا و پێشەواکەی، ئەڵبەت ئەمە نابێ لە ڕووی ترس و زەلیلییەوە بێ، بەڵکو دەبێ لە ڕووی خۆشەویستی دڵ و ناخ و ـ لانی کەم ـ لە ڕووی ڕێزگرتنەوە بێ.

3ـ عیشقێك بۆ هاوتەریبەکان، ئەوانەی کە لە یەك ئاست و پلەدان، وەك عیشقی ژن و مێر بۆ یەکدی، یان خوشك و برا بۆ یەکدی.

4ـ عیشقێکی خەیاڵی و وێناکراو، وەك عیشقی نێوان خەڵکی بەبێ هەبوونی هیچ جۆرە پەیوەندی و بەرژەوەندییەکی دیاریکراو، تەنها لە ڕوانگەی هەستی مرۆڤدۆستی و بەرپرسیارێتی ئەخلاقییەوە.

5ـ عیشقێکی فیتری و سروشتی، وەك عیشق و خۆشەویستی نێوان خوا و بەندە، کە بە بەندایەتی و پەرستشەکان دەردەبڕدرێ، کە ئەم قۆناغەی عیشق و خۆشەویستی نواندن، دوایین قۆناغ و لوتکەی دەربڕینی عیشقە و بەچێژترین و پێویستترین و بەسودترینیانە.

## دوا پەیڤ

شاعیری بەناوبانگ (نظامی گنجوی) لە کۆتایی بەسەرهاتی (لەیلێ و مەجنون)دا قسەیەکی زۆر جوان و پڕ لە وانە و پەندی گرنگ لە زاری (لەیلێ)ەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (..لە کۆتا ساڵەکانی تەمەنیدا (لەیلێ) نەخۆش دەکەوێت و جوانی و ناسکی ڕوخسار و جەستەی لەدەست دەدا، بۆیە (لەیلێ) ڕووی کردە دایکی و وەسیەتی کرد و پێی وت کە: دایکە! ئەم پەیام و قسەیەم بە (مەجنون) بگەیەنە و پێی بڵێ: ئەگەر ویستت خۆشەویست و مەعشوقێك هەڵبژێری، ئەوا دۆست و مەعشوقێکی وەك من هەڵمەبژێرە، کە تەنها بە نەخۆشییەك هەموو جوانی و ناسکی و زەریفی خۆی لەدەست بدات و گوڵی جوانی سیس و پەژموردە ببێت و چالاکی و هێزی لەدەست بدات، بەڵکو مەحبوب و مەعشوقێك بۆ خۆت هەڵبژێرە کە قەت لەناو ناچێت و جوانی و جەماڵی لەدەست نادات و هەمیشەییە...)

دواجار و زۆر بە کورتی و بە پوختی دەڵێین: عیشق و خۆشەویستی ڕاز و دەستکەلای پەیوەندی و دۆستایەتی نێوان عاشق و مەعشوقەکان بەگشتی و خوا و بەندەیە بە تایبەتی، تا ئەم ڕاز و دەستکەلایە لە نێوان خوا و بەندەدا نەبێت و بە جوانی و پاکی و بەرانەتەوە خۆی نەنوێنێ، نابێ بڕوامان بە پەیوەندی و دۆستایەتی ڕاستەقینەی بەندە هەبێت لەگەڵ خوادا.

عیشق و خۆشەویستی یەکێکە لە جوانترین و ناسکترین و گرنگترین خەڵاتەکانی خوا بۆ مرۆڤ، کە هەر لە سەرەتای دروستبوونیەوە پێی بەخشیوە، کە بەهۆی ئەو خەڵاتەوە دڵی زیندوو کردووەتەوە و وزەی پێ بەخشیوە، مەولانا گوتەنی:

**ناف ما بر مهر أو ببریده‌اند**
**عشق أو در جان ما کاریده‌اند.**

واتە: ناوکی ئێمەیان بە مەقەستی میهر و سۆز و بەزەیی خوا بڕیوە و لێیانکردووەتەوە، دواتر و پاش بڕینی ناوکمان بەو شێوەیە، تۆوی عیشق و خۆشەویستی خوایان لە دڵماندا چاندووە.

*****

# مانای وشەی سیاسەت لە قورئان و سوننەتدا

نووسینی : د.یوسف قەرەزاوی
وەرگێڕانی: محەمەد حەسەن عەبدوڵلا

## سیاسەت لە زمانەوانیدا:

سەرچاوەکەی بریتییە لە (ساس-یسوس-سیاسە)، دەگوترێت: فلان کەس ئاژەڵەکە یان ئەسپەکەی ڕاهێنا، کاتێك کە ئەو کەسە کارەکانی جێبەجێ دەکات لە ئالیك پێدان و ئاوپێدان و ماڵیکردن و پاککرنەوە و...هتد.

پێم وایە ئەمە مانای بنەڕەتییە کە سیاسەتی مرۆڤی لێ وەرگیراوە، بەو مانایەی کە پاش ئەوەی مرۆڤ سیاسەتی گیانلەبەرانی مومارەسە کردووە، گەیشتووە بە سیاسەتی مرۆڤ و سەرکردایەتی کردنیان لە جێبەجێ کردنی کارەکانیاندا، وەك لە فەرهەنگەکاندا هاتووە، واتە: فەرمانم پێکردن و ڕێگریم لێ کردن یان پێی هەستا، یان واتە هەستان بە کارێك بەهۆی شتێکەوە کە چاکی بکات.

ئینسکلۆپیدیای زانستی سیاسەت کە لە زانکۆی کوەیتەوە دەردەچێت- لە فەرهەنگی (ڕۆبێر)ەوە گواستوویەتیەوە دەڵێت: سیاسەت هونەری بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکانە.

بە پێی فەرهەنگی (کامل): سیاسەت پەیوەستە بە فەرمانڕەوایەتی و بەڕێوەبردن لە کۆمەڵگای مەدەنیدا.

بە گەڕانەوەش بۆ فەرهەنگی زانستە کۆمەڵایەتییەکان سیاسەت ئاماژەیە بۆ ئەو کردارانەی مرۆڤ کە پەیوەستن بە هەڵگیرسانی ململانێیەکان یان یەکلاکردنەوەیان بە دەوری بەرژەوەندی و چاکەی گشتیدا، کە هەمیشە بەکارهێنانی هێز یان تێکۆشان لەپێناویدا لەخۆ دەگرێت، هەروەها فەرهەنگی یاساییش سیاسەت پێناسە دەکات بە بنچینە یان هونەری بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی.

## وشەی سیاسەت لە کەلەپووری ئیسلامیماندا

پاش ئەوەی مانای وشەی (سیاسەت)مان زانی لە ڕووی زمانەوانی و زاراوەییەوە، دێینە سەر ئەوەی کە لە کەلەپووری ئیسلامی و فیقهی و هزری ئیسلامی و لە سەرچاوە ئیسلامییەکانماندا بۆی بگەڕێین.

ئایا لە قورئانی پیرۆزدا دەیدۆزینەوە؟ ئایا لە سوننەتدا یان لە فیقهی مەزهەبە شوێنکەوتووەکاندا یان جگە لەوە لە فیقهی ئازاددا دەیدۆزینەوە؟ ئایا جگە لە زانایان لای سۆفی و فەرمانڕەوا و فەیلەسوفەکان ئەم وشەیە دەدۆزینەوە؟

ئەمانە و ئەوانە (هەر یەکەیان) چۆن باسی سیاسەت دەکەن؟ هەڵوێستی شەرعی وەرگیراو لە قورئان و سوننەتەوە چییە دەربارەی هەموو ئەمانە؟

## وشەی سیاسەت لە قورئاندا نەهاتووە

وشەی سیاسەت لە قورئانی پیرۆزدا نەهاتووە، نە لە ئەو سورەتانەی کە لە مەککە دابەزیون و نە لە ئەو سورەتانەی کە لە مەدینە دابەزیون، هیچ دەربڕینێك کە لە وشەی سیاسەتەوە هاتبێت چ وەسف بێت یان کردار نەهاتووە، هەر کەسیش (المعجم المفهرس لألفاظ القرآن الكريم) بخوێنێتەوە ئەمەی بۆ دەردەکەوێت، هەر بۆیە راغبی ئەصفەهانی لە (مفردات)ەکەیدا باسی نەکردووە، لە (معجم ألفاظ القرآن)یشدا نەهاتووە کە

# وشەی سیاسەت لە قورئانی پیرۆزدا نەهاتووە.... وشەی (الفضیلة)ش کە لە قورئاندا نەهاتووە، بەلام قورئان لە سەرەتاوە تاوەکو کۆتاییەکەی پڕیەتی لە جەختکردنەوە لەسەر چاکە و پیاوەتی و دوورکەوتنەوە لە خراپە

کۆمەڵـەی زمـانی عـەرەبی دەریـانکردووە، ڕەنگـە هەنـدێك ئەمـە بکاتـە بەڵگـە بـۆ ئـەوەی بڵێـت: قورئـان یـان ئیسـلام پەیوەندی بە سیاسەتەوە نییە.

بـێ گومـان ئـەم وتەیـەش نموونەیـەکی تێکەڵاوکردنـە، ڕەنگە زاراوە و وشەی لەو جۆرە لە قورئانی پیرۆزدا نەبێت، بەلام مانا و تێگەشتنەکەی بە فراوانی لە قورئاندا هەیە.

نموونەیەك بۆ ئەوە دەهێنمەوە بـە وشـەی (العقیـدة) کـە لـە قورئاندا نییە، بەلام لەگەڵ ئەمەدا تێگەشـتن و مانـای عەقیـدە لـە هەموو قورئاندا هەیە، کە بریتییە لە باوەڕهێنـان بـە خـوای گەورە و فریشـتەکانی و کتێبـەکانی و پێغەمبـەرەکانی و ڕۆژی دوایـی، بەڵکو عەقیدە یەکەم تەوەرەیە کە ئایەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز بـە دەوریدا دەسوڕێنەوە.

هەروەها وشەی (الفضیلة) کە لە قورئاندا نەهاتووە، بـەلام قورئـان لە سەرەتاوە تاوەکو کۆتاییەکەی پڕیەتی لە جەختکردنـەوە لەسـەر چاکە و پیاوەتی و دوورکەوتنـەوە لە خراپە و کرداری نابەجێ.

قورئانی پیرۆز هەرچەندە وشـەی (السیاسة)ی تێدا نەهاتبێت، بەلام ماناکەیی تێدایە، بە نموونە وشەی (الملك) کە مانای فەرمانڕەوایـەتی کردنـی خـەڵك و سـەرکردایەتی کردنیـان دەگەیـەنێت لـە کارەکانیاندا، ئەمەش لە قورئانـدا بـە چـەندین دەربـڕین و شـێوازی جیـاواز هـاتووە، هەنـدێکی پێداهەڵـدان و هەندێکیشـی سەرزەنشتە، ئەوەتا فەرمانڕەوای دادپـەروەر هەیـە و فـەرمانڕەوای ستەمکاریش هەیە، فـەرمانڕەوای شورا و ڕاوێژ هەیە و فـەرمانڕەوای قۆرخکار و دیکتاتۆریش هەیە.

قورئانی پیرۆز باسـی فـەرمانڕەوای چاك و پێداهەڵدراو دەکات:﴿ فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَـاهُمْ مُلْكـاً عَظِيمـاً﴾ (النسـاء:54)، واتـە: خـۆ بـێ گومان ئێمـە بـە نـەوەی ئیـبراهیم کتێبمـان بەخشـیوە (بـە موسـا تەورات و بـە عیسا ئینجیل و بە موحەممەدیش ـ د.خ ـ قورئـان) هەروەها لە چەندین جۆر دانـایی بـەهرەوەرمان کـردوون و (بـە هەندێکیان) وەك (یوسف و داود و سـولەیمان) دەسـەڵات و پاشـایەتییەکی گـەورەمان بەخشیوە.

لە نەوەی ئیبراهیم باسـی یوسـف دەکات، کە لەگەڵ خوای گەورەدا ڕاز و نیـازی کـرد و گـوتی:﴿ رَبِّ قَـدْ آتَيْتَنِـي مِـنَ الْمُلْـكِ﴾(یوسـف: 101)، واتـە: یوسف پێغەمبەر چووە کەنارەوە و دەستەکانی هەڵبڕی و نزای کرد و گوتی: پەروەردگارا بەڕاستی تۆ پاشایەتیت پێ بەخشیم.

یوسـف(سـڵاوی خـوای لێ بـێ) گـوتی "لـە فـەرمانڕەواییت پێبەخشـیم" چـونکە سـەربەخۆ نەبوو لە فەرمانڕەوایەتیدا، بـەڵکو فەرمانڕەواییـەك کـە لـە سەروویەوەیەتی پێی گوت: ﴿إِنَّكَ الْيَـوْمَ لَـدَيْنَا مَكِـينٌ أَمِـينٌ﴾ (یوسف:54)، واتـە: ئـەمڕۆ ئـیتر بەڕاستی تۆ لای ئێمە خاوەنی پلە و جێگەی متمانە و باوەڕی.

هـەر لەوانـەی کـە خـوای گـەورە فەرمانڕەوایـەتی پـێ بەخشـین (طـالوت) بـوو کـە خـوای گـەورە کردیـە سـەرکردە و فـەرمانڕەوای بـەنی ئیسـرائیل، تـاوەکو لـەژێر بەیداخی ئـەودا بجەنگن:﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّـهَ قَـدْ بَعَـثَ لَكُمْ طَـالُوتَ مَلِكـاً﴾ (البقـرة:247)، واتـە:ئینجـا پێغەمبەرەکـەیان (بەوانـەی کـە ئامـادەی جـەنگ بـوون) گـوتی: ئـەوە ئـیتر خـوا بەڕاسـتی بڕیـاری داوە و تـالوتی ڕەوانـە کـردووە کـە پاشـا و سەرکردەتان بێت.

هەروەها قورئان بەسەرهاتەکەی لەگەڵ جالوتدا دەگێڕێتەوە کە کۆتایی پێدێنێت بە:﴿ وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ﴾(البقرة:251)، واتە: داود (کە یەکێك بوو لە سەربازانی تالوت) جالوتی کوشت، لەوەودوا خوای گەورە پاشایەتی و دانایی پێبەخشی و هەرچی ویستی بوو فێری کرد.

سولەیمانیش کە خوای گەورە دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتییەکی پێ بەخشی کە پاش ئەو کەسی دیکە دەستی ناکەوێت.

هەر لە ئەو فەرمانڕەوایانەی کە قورئانی پیرۆز باسی کردوون: (ذوالقرنین)ە کە خوای گەورە توانا و دەسەڵاتی لە زەویدا پێ بەخشیبوو، بۆ هەر شتێکی پێویستی ئەو سەردەمەش هۆکارەکەی بۆ ڕەخساندبوو، فەرمانڕەوایەتییەکەی فراوان کرد لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات، لە قورئانی پیرۆزیشدا خوای گەورە بەسەرهاتەکەی باس دەکات و دەفەرموێت:﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ﴾ (الكهف:84)، واتە: ئێمە توانا و دەسەڵاتمان لە زەویدا پێ بەخشیبوو.

هەر لەوانەی کە قورئان باسی کردوون: فەرمانڕەوای (سبأ)ە کە فەرمانڕەوایەتییەکەی لەسەر بنەمای شورا دامەزرابوو، نەك تاکڕەوی و حوکمی تاکەکەس:﴿مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْراً حَتَّى تَشْهَدُونِ﴾(النمل:32)، واتە: (بەلقیس بە ئامادەبووانی گوت): خۆ من هیچ بڕیارێکم نەداوە هەتا ئێوە لێ ئاگادار نەبووین و ڕاتان لەسەری نەدابێت.

لە بەرامبەر ئەمەدا قورئان سەرزەنشتی فەرمانڕەوای ستەمکار و داگیرکار دەکات، ئەو فەرمانڕەوایەی کە دەستی گرتووە بەسەر دروستکراوەکانی خوای گەورەدا، وەك فەرمانڕەوایی نەمرود.

هەروەها فەرمانڕەوایەتی فیرعەون کە:﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعاً يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ﴾(القصص:4)، واتە: بێ گومان فیرعەون زاڵ و درندە بوو لە وڵاتەکەیدا، خەڵکەکەی پارچە پارچە کرد (جیاوازی خستە نێوانیانەوە)، دەستەیەکیانی دەچەوساندەوە و لاوازی دەکردن، منداڵە نێرینەکانی سەر دەبڕین، کچان و ئافرەتانی (بە زەلیلی) دەهێشتەوە)، بەڕاستی ئەو ستەمکارە یەکێك بوو لەوانەی تۆوی خراپەی دەچاند.

هەندێك فەرمانڕەواش قورئان نە پێیدا هەڵداون و وەسفی کردوون نە سەرزەنشتیشی کردوون، وەك فەرمانڕەوای میسر لە سەردەمی یوسفدا (علیە السلام)، ئەو بوو کە یوسفی کردە سەرپەرشتیار و بەڕێوەبەری خەزێنەی زەوی، کە لە قورئاندا باس لە هەندێك هەڵسوکەوتی دەکات کە سیاسەتی باش و گونجاوی دەردەخات لە فەرمانڕەوایەتییەکەیدا.

ئەمە هەمووی قسەکردن بوو لەسەر سیاسەت و سیاسەتمەداران لەژێر وشەیەکی غەیری وشەی سیاسەتدا.

هەروەها وشەی (التمكين) وەك لە فەرمایشتەکەی خوای گەورەدا هاتووە:﴿وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ﴾(یوسف:56)، واتە: (خوا دەفەرموێت) ئا بەو شێوەیە دەسەڵاتمان دا بە یوسف و جێگیر و پایەدارمان کرد لە خاکی میسردا، هەر پلە و پایەیەکی دەویست لەو وڵاتەدا دەستی دەکەوت و بۆی ساز دەبوو.

هەروەها دەربارەی بەنی ئیسرائیل:﴿ وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ﴾(القصص:5)، واتە: ئێمەش دەمانەوێت دەروو بکەینەوە لە چەوساوەکان و منەتی خێر بکەین بەسەر لاوازکراوەکاندا لە وڵاتدا و دەمانەوێت بیانکەینە پێشەوا و بیانکەینە میراتگری سامان و دەسەڵاتی ستەمکاران.

هەروەها:﴿ الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾(الحج:41)، واتە: ئەوانەی کە ئەگەر پایەدارمان کردن لە زەویدا نوێژ و دروشمەکانی بە چاکی ڕادەگرن، زەکاتیش بە تەواوی دەدەن، فەرمان بە چاکە دەکەن، قەدەغە لە خراپە

دەکەن، سەرئەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە.

هەروەها وشەی (الأستخلاف) و ئەوەی کە لێوەی وەردەگیرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾(النور:55)، واتە: خوا بەڵێنی دڵنیابەخش و تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوە و کار و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە بەراستی لە ئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات لە وڵاتدا هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووە و ئەو دین و ئاینەیان بۆ دەچەسپێنێت خوا خۆی پێی رازییە، هەروەها ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێت بە ئارامی و هێمنی، ئەو کاتە ئیتر بە تەواوی هەر من دەپەرستن و هەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێکم بۆ بڕیار نادەن، ئەوسا ئەوەی دوای ئەو پایەدارییە بێ باوەڕبێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە هەر تاوانبار و لە سنوور دەرچوون.

لە جێگەیەکی تریشدا دەفەرموێت :﴿ قَالُوا أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِن بَعْدِ مَا جِئْتَنَا قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾(الأعراف:129)، واتە: (قەومەکەی موسا دیارە زۆر لە ناخۆشیدا بوون) بۆیە گوتیان: پێش ئەوەی تۆ بێیتە ناومان و دوای ئەوەش کە هاتوویت (بارودۆخی ئێمە نەگۆڕاوە) هەر ئازاردراو بووین، موسا گوتی: ئومێد وایە پەروەردگارتان دوژمنەکەتان لەناوببات و بتانکاتە جێنشین لە زەویدا، ئەوسا سەیرتان دەکات کە ئێوە چۆن کار دەکەن!!

بە هەمان شێوە وشەی (الحکم)یش لەگەڵ ئەو وشانەی کە لێوەی وەردەگیرێن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾(النساء:58)، واتە: بێ گومان خوا فەرمانتان پێ دەدات کە هەموو ئەمانەتەکان (سپاردەکان) بگەڕێننەوە دەست خاوەنەکانیان و هەر کاتێکیش داوەریتان کرد لە نێوان خەڵکیدا، دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بکەن، چونکە بەراستی خوا بە جوانی و چاکی و تەواوی ئامۆژگاری و فەرمانتان پێ دەدات، بەراستی خوا هەمیشە و بەردەوام بیسەر و بینایە.

ئەمەش هەمان ئایەتە کە ئیبن تەیمیە نیوەی کتێبەکەی (السیاسە الشرعیە) لەم تەوەرەیەدا دەسوڕێتەوە، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ (49) أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ (المائدة:49-50)، واتە: (کاتێك هەندێك لە زاناکانی جوو، هاتن بۆ لات تا داوەریی بکەی لە نێوانیاندا)، داوەری بکە بەو بەرنامەیە (قورئانە)ی کە لەلایەن خواوە بۆت دابەزیوە، شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە، وریابە نەوەکو ئەوان رێت لێ هەڵە بکەن لە هەندێك لەو رێنموویانەی کە خوا بۆی ناردوویت (جا ئەگەر ئەو جولەکانە رازیی نەبوون) و پشتیان هەڵکرد، ئەوە بزانە بەراستی خوا دەیەوێت گیرۆدەی سەرئەنجامی هەندێك لە گوناهەکانی خۆیانیان بکات، بێ گومان زۆربەی خەڵکی یاخی و سەرکەش و تاوانبارن، ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لا پەسەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاك و بەجێ بێت، (بە تایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بە وردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی

زیندوویان هەیە.
:﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾(المائدة:45)، واتە: بێ گومان ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا دایبەزاندووە، ئا ئەوانە هەر ستەمکارن.

هەروەها لە ئایەتی :﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (المائدة:47)، واتە: ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا دایبەزاندووە، جا ئا ئەوانە ناپاک و تاوانبار و لە سنوور دەرچوون.

لە ئایەتێکی تردا:﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ (المائدة:44)، واتە: جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا دایبەزاندووە، ئا ئەوانە بێ باوەڕن.

## ئەوەی لەبارەی سیاسەتەوە هاتووە لە سوننەتدا

لە سوننەتی پێغەمبەردا (د.خ) فەرموودەیەك هاتووە کە وشەیەکی تێدایە لە سیاسەتەوە وەرگیراوە، ئەویش ئەو فەرموودەیەیە کە(متفق علیه)یە و لە ئەبی هورەیرەوەیە کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: "كانت بنو إسرائيل تسوسهم الأنبياء، كلما هلك نبي خلفه نبي، و أنه لا نبي بعدي، و سيكون خلفاء فيكثرون". قالوا: فما تأمرنا؟ قال: "فوا ببيعة الأول فالأول، و أعطوهم حقهم الذي جعل الله لهم، فأن الله سائلهم عما استرعاهم".

واتە:بەنوئیسرائیل لەلایەن پێغەمبەرانەوە کاروباریان بەڕێوە دەبردرا و سەرپەرشتی ئیش و کاری ڕۆژانەیان دەکرا، کاتێکیش کە پێغەمبەرێك نەمابێت پێغەمبەرێکی تر لەدوایەوە هاتووە، بەڵام دوای من پێغەمبەر نایەت و من دوایین پێغەمبەرم و دوای من خەلیفە دێن، گوتیان: فەرمانمان بەچی پێ دەکەیت؟ پێغەمبەریش فەرمووی: یەك لەدوای یەك بەیعەتیان پێ بدەن و ماف خۆیانیان پێ بدەن کە خوای گەورە پێی بەخشیون، خوای گەورە پرسیاریان لێ دەکات دەربارەی ئەوانەی کە خوای گەورە ئەمان (پێغەمبەرەکان)ی کردووە بە فەرمانڕەوایان و کاروباریانیان بەدەستە.

> یەکەم بەکارهێنانی وشەی سیاسەت لە کەلەپووورماندا بە مانای خاوەنێتی ماف و فەرمانڕەوایەتی

لە (الموسوعة الفقهية الكويتية) دا و لە ماددەی (سیاسە)دا هاتووە دەڵێت: کۆنترین دەقێك کە وشەی سیاسەتی تێدا هاتبێت بە مانایەك کە پەیوەستە بە فەرمانڕەوایەتییەوە بریتییە لە قسەیەکی عەمری کوڕی عاص بۆ ئەبی موسای ئەشعەری کە وەصفی معاویە دەکات و دەڵێت: من وای دەبینم کە جێگرەوە و خاوەن ماف عوسمانی جێنشینی ستەملێکراوە، خۆنەویستە، سیاسەت و ڕێکخستنی گونجاو و باشە.

ئەمەش وەردەگیرێت ئەگەر مەبەست لێی وشەی (سیاسەت) بێت وەك سەرچاوە، هەروەك لە فەرموودەکەی پێشەوە کە(متفق علیه) بوو و لە ئەبوهورەیرەوە بوو، هەروەها پاش ئەوەش لەسەردەمی پێشەواامان عومەری کوڕی خەتتابەوە(ر.خ) هاتووە.

ئیبن ئەبی شەیبە و حاکم ریوایەتیان کردووە، کە عومەری کوڕی خەتتاب (ر.خ) قسەی بۆ موسڵمانان دەکرد و دەیگوت: بەخوای کەعبە دەزانم کەی عەرەب لەناودەچن! لەو کاتەدا پیاوێك لەناو موسڵماناندا هەستایەوە و گوتی: کەی لەناودەچن ئەی ئەمیری موسڵمانان؟ عومەریش (ر.خ) فەرمووی: کاتێك کەسێك کاروبارەکانیان دەبات بەڕێوە کە کاروباری سەردەمی نەزانیی چارەسەر نەکردبێت و کەسێك کە هاوەڵی پێغەمبەری (د.خ) نەکردبێت.

بەهەمان شێوە لە چەند هاوەڵێکی تریشەوە دەیگێڕنەوە کە ئەم وشەیەیان و کردار و بە مانای فەرمانڕەوایەتی و بەڕێوەبردنی وڵات بەکارهێناوە.






مەغدید سدیق هورمزی

﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَخَرُّوا لَهُ سُجَّدًا وَقَالَ يَاأَبَتِ هَـذَا تَأْوِيـلُ رُؤْيَايَ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا وَقَدْ أَحْسَـنَ بِـي إِذْ أَخْرَجَنِـي مِـنْ السِّجْنِ وَجَاءَ بِكُمْ مِنْ الْبَـدْوِ مِـنْ بَعْدِ أَنْ نَزَغَ الشَّـيْطَانُ بَيْنِـي وَبَـيْنَ إِخْوَتِي إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ(100)رَبِّ قَـدْ آتَيْتَنِي مِـنْ الْمُلْـكِ وَعَلَّمْتَنِـي مِـنْ تَأْوِيلِ الآحَادِيثِ فَاطِرَ السَّـمَاوَاتِ وَالآرْضِ أَنْـتَ وَلِـيِّ فِـي الـدُّنْيَا وَالآخِرَةِ تَـوَفَّنِي مُسْـلِمًا وَأَلْحِقْنِـي بِالصَّـالِحِينَ(101)﴾، (سـورەتی یوسف). خـوای گـەورە لـەم دوو ئایەتــــەدا، باســـی کۆتـــایی سەرگوزشـــتەکەی حـــەزرەتی یوسـفمان بـۆ دەکـات (سـەلامی خوای لەسەر بێ) کـە حـەزرەتی یوسـف دایـك و بـاوکی دەخاتـە شوێنی خۆی، واتـە سـەر تـەختی حوکمڕانییەکـەی خـۆی، دواتـر هـەموویان بـۆ حـەزرەتی یوسـف دەکەون بـەڕوودا و سـوژدەی بـۆ دەبەن، لەوێدا حەزرەتی یوسـف دەفەرموێ: ئـەی بـاوکی شـیرینم ئەوە لێکدانەوەی ئەو خەونە بوو کە پێشتر دیبووم، ئەوەتا خـوای گـەورە بەڕاسـتی گێـڕا، خـوای پەروەردگار چاکەی لەگەڵ کـردم کە منی لە بەندیخانـە دەرهێنـا و ئێوەشی لە بیابان و لادێوە هێنـا لای مـن بـۆ شـار، دوای ئـەوەی شـەیتان ناخۆشـی خسـتە نێـوان مـن و براکـانم، بێگومـان خـوای گەورە بەسۆز و میهرەبانە بۆ ئەو شتەی کە بیەوێ، هەر خوا خۆی زانـای کاربـەجێ و کاردروسـتە، پاشـــان ڕوو دەکاتـــە خـــوای پـــەروەردگار و دەفـــەرموێ: پەروەردگارا بەڕاستی هەندێك لـە موڵك و حوکمداری و هەنـدێکیش لــە لێکدانــەوەی خــەونت پــێ بەخشـیوم، ئـەی دروسـتکەری ئاسمانــــەکان و زەوی تـــــۆ پشـتیوانی منـی لـە دونیـا و لـە ئاخیرەتـــدا، پـــەروەردگارا بـــە موسـڵمانی بممرێنـە و بمگەیەنـە بە کاروانی پیاوچاکان.

ئـــەوە بـــەکورتی پوختـــەی مانـای ئـەو دوو ئایەتـە پـیرۆزە بوو، کە دیارە کۆمـەڵێك پەنـد و عیبرەتیـــان لـــێ وەردەگـــیرێ،

ەرموە هەندێکیان:

* لەبیرکردنی هەموو ئەو ڕووداو و نارەحەتیانەی کە بەسەرت هاتووە، بەتایبەت دوای ئەوەی دەرگای ڕەحمەتی خواییت بۆ والا دەبێ و نارەحەتییەکان نامێنن، بەڵکو زەق کردنەوەی ئەو نیعمەت و بەخششانەی کە خوا پێی بەخشی لەدوای نارەحەتییەکان (بەکورتی واتە ڕابردوو لەیاد بکە و بیر لە داهاتووت بکەوە) وەکو ئەوەی کە حەزرەتی یوسف کردی.

* قین لەدڵ نەبوون و بوغزن نەبوون بەتایبەت بەرامبەر خوشك و برا و کەسوکار و هاوکارانت ئەگەر هەڵەیەك یان کەمتەرخەمییەکیان لێ ڕوویدات، خۆ ئەگەر باسیشت کرد ئەوا دەبێ تۆباڵی ئەو کەمتەرخەمی و هەڵانە (یوسف ئاسا) بخەیتە پاڵ شەیتان (بەکورتی واتە من و تۆ هیچ گرفتێکمان نابێ ئەگەر پیلان و فێڵی شەیتان نەکەوێتە نێوانمان).

* بیرنەکردنەوە لەتۆڵە بەتایبەت بەرامبەر نزیکەکانت کە بەردەوام لەگەڵیاندای، با ئەو نزیکانەشت زیانێکت پێ بگەیەنن، چونکە بیرکردنەوە لەتۆڵە، سەرەتا دڵ و دەروونی خۆت پێی گرفتار و تووشی ئازار دەبێ (بەکورتی واتە کاری موسڵمانی پابەند و دیندار بریتییە لە کار نەك کاردانەوە).

* دوعاکردن و پاڕانەوەی بەردەوام لە خوای گەورە کە کۆتایی ژینت واتە مردن و لە دنیا دەرچوونت بە موسڵمانی بێ، کە ئەوە بەرهەم و سەرمایەی هەموو تەمەنتی پێوە بەستراوە (بەکورتی واتە بیر لە چارەنووسی کۆتاییت بکەوە نەك تەنیا سەرەتا و ناوەڕاستەکەی).

* بیر کردنەوە لەوەی کە لەدوارۆژدا حەز دەکەی ببی بە هاوەڵ و ڕەفیقی کێ لە قیامەتدا، ئەگەر حەز بە هاوڕێیەتی پیاوچاکان دەکەی دەبێ لەسەر ڕێچکەی پێغەمبەران و پیاوچاکان بڕۆی و شوێن پێی ئەوان هەڵگری (بەکورتی واتە حەز کردن بە دیداری پیاوچاکان و خۆشویستنیان).

خودای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلاَ أَوْلاَدُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمْ الْخَاسِرُونَ﴾، (سورةتي المنافقون).

خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا، خیتابی ڕوو بە ئیمانداران دەکا وەکو لە زۆر شوێنی تری قورئاندا هاتووە و دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، بێگومان ئیمان هێنان بریتییە لە باوەڕ هێنانی تەواو بە هەر شەش پایەکەی ئیمان)، (ماڵ) و (منداڵ)تان بێئاگاتان نەکەن لە یادی خوا و لە پابەند بوون بە یاسا و ڕێساکانی ئەو و بەکتاپەرستی ئەو، چونکە هەر کەسێك وابکات واتە (ماڵ) و (منداڵ)ەکەی بێئاگای بکەن لە خوا، ئەوا بێگومان لە دۆڕاوەکان دەبێ، دۆڕاویش بە کەسێك دەگوترێ کە لە شتێکدا خۆی زۆر ماندوو بکات و ڕەنجی زۆری بۆ بکێشێ و کاتی زۆری بۆ تەرخان بکات بە ئومێدی ئەوەی پێیەوە بەختەوەر بێ، بەڵام لە دەرەنجامدا مایەپووچ دەرچێ و هیچ شتێك بەدەست نەهێنێ، بۆیە خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە کە لە مامەڵەکردنمان لەگەڵ (ماڵ) و (منداڵ) دا دەبێ زۆر وریا بین بەشێوەیەك کە هەموو ماندوو بوون و ڕەنج و کاتێکمان بۆیان تەرخان نەکەین تاکو تووشی بێئاگایی نەبێن لە دونیادا و ڕەنج بەخسار و مایە پووچی ڕۆژی دواییش نەبین.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەکرێ کۆمەڵێك پەند و عیبرەت و وانەی لێوە هەڵێنجین، کە

ئەمانەی خوارەوە هەندێکیانن:

* مرۆڤی ئیماندار نابێ هیچ شتێك بێئاگای بکات لەو چەمکانەی کە دەکەوێتە ناو بواری ئیمانەکەیەوە، گەرنا ئیمانەکەی لەق دەبێ.

* (ماڵ) و (منداڵ) دوو بەخشش خوای گەورە بە بەندەکانی خۆی دەبەخشێ هەر یەکە و بە ڕێژەیەکی دیاریکراو کە خۆی بە دانایی و حیکمەتی خۆیەوە دەیانبەخشێ، کە دەبنە هۆی خۆشی بەخشین بە ژیان، بەڵام لە کاتی نەبوونیاندا دەبێ بەندەکان ئارامگرین و لە بوونیشیاندا دەبێ بەندەکان سوپاسگوزار بن، بۆ ئەوەی لەهەردوو باردا بێئاگا نەبن.

* مرۆڤی ئیماندار پەیوەندی بە (ماڵ) و (منداڵ)ەوە پەیوەندییەکی ڕۆحی و قەلبی نییە، بەو مانایەی کە هەموو ڕۆح و دڵ و مێشکی دابگرن و، هەموو خەم و خەفەتێکی لە پێناویاندا هەڵڕێژێ.

* مرۆڤی ئیماندار دەبێ ژیرانە مامەڵە بکات لە دونیادا لەگەڵ (ماڵ) و (منداڵ)، بۆ ئەوەی (ماڵ) و (منداڵ)ەکەی ببنە سەرمایەکی باش تا لە قیامەتدا لە سەرکەوتوواندا بێ و لە دۆڕاوەکاندا نەبێ.

* مرۆڤی ئیماندار دەبێ بە

**دوعاکردن و پاڕانەوەی بەردەوام لە خوای گەورە کە کۆتایی ژینت واتە مردن و لە دنیا دەرچوونت بە موسڵمانی بێ، کە ئەوە بەرهەم وسەرمایەی هەموو تەمەنتی پێوە بەستراوە**

شێوەیەکی هاوسەنگ مامەڵە لەگەڵ (ماڵ) و (سامان)دا بکات، واتە لەبەر ئەوەی ژیان بێ (ماڵ) ناچێتە سەر دەبێ هەوڵی بۆ بدات، بەڵام نابێ هەوڵەکەی بەو شێوەیە بێ کە لە ڕادەی پێویست بترازێ.

﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الآخِرَةَ وَلاَ تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلاَ تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ﴾، سورەتی (القصص – 77).

خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا باسی مرۆڤی ئیماندار دەکات کە پێویستە چۆن مامەڵە لەگەڵ دونیا و قیامەتدا بکات و بە چ شێوەیەك هاوسەنگی لەنێوانیاندا بپارێزێ، هەروەها چۆن و بەچ شێوەیەك باش ڕەفتار بکات و چاکەخوازبێ لەگەڵ خۆی و دەوروبەری و بوونەوەر بەگشتی، هەروەکو چۆن خوای گەورە لەگەڵیدا باش بووە و چاکەی زۆری لەگەڵدا کردووە، دواتر دەفەرموێ کە ئیماندار نابێ بەهیچ شێوەیەك بیری بەلای خراپەکاریدا بچێ، چونکە خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێ کە خەریکی خراپە و بڵاوکردنەوە و برەودانن بەکاری خراپە لەسەر زەویدا، بەڵام ئەگەر لەبەشی یەکەمی ئایەتەکەدا زۆر وردبینەوە، زۆر بە ئاشکرایی خوای گەورە چۆنیەتی هاوسەنگی کردنمان بۆ ڕوون دەکاتەوە لە نێوان دنیا و قیامەتدا، کە دەفەرموێ: لەوەی کە خوای گەورە پێی داوی لەهەموو جۆرە بەخششێك، قیامەتی پێبەدەست بێنە (کە

ئەوە هێڵە گشتییەکەیە) بەڵام لەپاڵ ئەو هێڵە گشتییەدا کە بەدەست هێنانی قیامەتە، بەشی خۆت لە دنیا لەبیر مەکە (ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لەبیر نەکردنی دنیا هێڵە سەرەکییەکەی ئیماندار نییە)، کەوابێ نابێ وەکو زۆر کەس بە هەڵە لەو ئایەتە حاڵی بوونە گوایە دەبێ مرۆڤ خەریکی دنیا بێ و هەوڵی بۆ بدات، بەڵام دەبێ قیامەتیشی لەبیر بێ و کاری بۆ بکات، بەم شێوەیە وا دەردەکەوێ کە کارکردن و هەوڵدان بۆ دنیا هێڵە گشتییەکەیە و کارکردن بۆ قیامەتیش هێڵە لاوەکییەکەیە، کە ئەمەش دیارە پێچەوانەی واتای ئەم ئایەتە پیرۆزەیە.

هەندێك لەو پەند و ئامۆژگاری و وانانەی لەو ئایەتەوە پێویستە فێری بین:

* مرۆڤی ئیماندار هەرچی خوا پێی بەخشیوە لە بەخششە ماددی مەعنەوییەکان لە ژیان و عەقڵ و تەندروستی و هەستەکان و ئاسایش و خۆشنودی و سەروەت و سامان و ماڵ و منداڵ و قسەی ڕەوان و کەسایەتی و شکۆمەندی و زانست و زانیاری و... تاد، بەهەموو ئەو بەخشش و غەیری ئەوانەشەوە دەبێ هەوڵی بنیاتنانی ماڵی قیامەتی بێ و بەجوانی ئاوەدانی بکاتەوە، چونکە لەو ماڵەدا بە جێگیری و بەردەوامی دەمێنێتەوە، نەك بەردەوام خەریکی ئاوەدانکردنەوەی ماڵی دنیای بێ کە ماڵێکی کاتییە و زۆر زوو بەجێی دێڵێ، کەواتە کاری سەرەکی ئیماندار لە دنیادا هەوڵدانە بۆ دەسخستنی ماڵی قیامەت، لەگەڵ ئەو کارەشیدا دەبێ بایی ئەوە بەشی خۆی لەدنیادا مەیسەر بکات.

**خوای گەورە چۆنیەتی هاوسەنگی کردنمان بۆ ڕوون دەکاتەوە لە نێوان دنیا و قیامەتدا، کە دەفەرموێ: لەوەی کە خوا پێی داوی لەهەموو جۆرە بەخشیشێك، قیامەتی پێبەدەست بێنە بەڵام لەپاڵ بەدەست هێنانی قیامەت، بەشی خۆت لە دنیا لەبیر مەکە**

* ئیماندار لە ژیانیدا دەبێ چاکەخواز و باش ڕەفتار بێ و بەردەوام چاکە بڵاوبکاتەوە، هەروەکو چۆن خوای گەورە چاکەی لەگەڵ ئەودا زۆرە بەڵکو نوقمی دەریای چاکەکانیەتی، واتە دەبێ مرۆڤی ئیماندار وەفای بێ بەرامبەر ئەو هەموو چاکانەی کە خوا لەگەڵیدا کردوویەتی بەوەی کە ئەویش لەگەڵ خۆی و دەوروبەری و کۆمەڵگەکەی چاك وباش بێ.

* نابێ ئیماندار بەهیچ شێوەیەك تواناکان و بەخششەکانی خوا کە پێی داوە بەکار بێنێ بۆ خراپەکاری و گەندەڵکاری، چونکە خراپەکاری وا لە خاوەنەکەی دەکات بچێتە ریزی ئەو کەسانەی کە خوا خۆشی ناوێن، ئەگەر یەکێکیش خوا خۆشی نەوێ دیارە کە ئاکامەکەی چۆن دەبێ.

# گەڕانەوە بۆ بەرپرسیارێتی پێغەمبەران

وەرگێڕانی: هێرۆ موحەممەد ئەڵماس



وا دێتە پێش چاو کە بەرپرسیارێتی ڕۆشنبیرانی ئایینی ـ بە بەراورد لەگەڵ ڕۆشنبیرانی دیکەدا - زۆر پڕ مەترسیترو لەهەمان کاتدا کارامەتر بێت، هەروەها بەرپرسیارێتی ڕۆشنبیرانی ئایینی لە بەرامبەر پێشکەشکردنی بیرو هزری ئایینیدا لەگەڵ بەرپرسیارێتی پێغەمبەراندا ـ سەلامی خوایان لێبێت - تەباو هاوبەش بێت.

پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لێبێت - بۆ ئەوە نەهاتوون تاوەکو هەموو دابو نەریتی نەتەوەو گەلەکانیان لەناو ببەنو بیانگەیەننە قۆناغی بێ شوناسی، ئەوان نەهاتوون تا ڕیسالەو پەیامی پێغەمبەرانی دیکە ـ سەلامی خوایان لیبێت - هەڵبوەشێننەوەو خەڵکی بخەنە نێو قەیرانی ئیمانەوە، پێغەمبەران هاتوون تا دابو نەریتە دروستەکان بژێننەوەو خراپیو ناباشیەکانی دابو نەریتە هەڵەکان لەناو بەرن، ئەوان شوناسی نەتەوەکانی خۆیانیان بە فەرمی ناسیوەو هەژمار کردووەو لە هەوڵی تەواوکردنی پەیامی پێغەمبەرانی پێش خۆیاندا بوون، ئەوان ئیمانی دروستو دینداری هۆشیارانەیان بەهێز کرد، بەڵام ئەسڵو بنەمای ئیمانیان لەناو نەبرد.

لەڕاستیدا پەیامی پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لێبێت - چاکسازیو ئیسڵاحی دابو نەریتو ڕەفتارەکانو ژیاندنەوەو نوێکردنەوەی تەواوی پەیامی پێغەمبەرانی پێش خۆیانو

بــەهێزکردنی بنـــەماو بـــەها بالآکـــان بـــوو لـــە نێـــوان مرۆڤەکاندا.

پێغەمبـــــــەری ئیســـــــلام موحەممـــەد(ﷺ) لــە مەککــەو مەدینـــەدا دەرکـــەوتو کەوتـــە دژایـــەتی کـــردنو ڕووبـــەڕوو بوونـــەوەی شـــیرکو هاوبـــەش بڕیاردانو هەموو جۆرە جەورو ستەمێك، بـەڵام بـیرو بـاوەڕە ڕەسەنەکانی ئایینی ئیبراهیمـی - کە نەوە لـەدوای نـەوە لـەنێو عەرەبـــــە جاهیلییەکانـــــدا مابوویەوە - لە نـاو نـەبرد، ئـەو زۆرێـــك لـــە دابو نەریتـــەکانی سەردەمی جاهیلیو نەفامی بـە فەرمی ناساندو دانـی پێدانان، تا ئەو ڕادەیـەی کـە زۆرێك لـە دابو نەریتـــەکانی ســـەردەمی نـــەفامیو پـــێش ئیســـلام لـــە مەراسیمی بەندایـەتی گـەورەی حەجـــدا تـــا ئێســـتەش وەك خۆیـــانو ماونەتـــەوە، بۆیـــە پێغەمبەر(ﷺ) تەنیا هەستا بە گـــۆڕینی ڕەفتـــارو ئاکـــارە خراپـەکانی سـەردەمی نـەفامی خـەڵکیو سـەردەمی خـۆی لـە دابو نەریتی بەندایەتی کردندا.

ڕۆشـنبیری ئـایینیش لـە وەهـا ڕێڕەوێکدا هەنگاو هەڵدەگرێت، ئـەو ڕەخنـەگری هـەڵو مـەرجو

**پێغەمبەران هاتوون تا دابو نەریتە دروستەکان بژێننەوەو خراپیو ناباشیەکانی دابو نەریتە هەڵەکان لەناو بەرن،**

بارودۆخی ئێستایە، لە بەرامبەر دابو نەریتـــە نادروســـتەکاندا ڕەخنـــەگرەو ناڕازییـــە، گیـــانو ڕۆحیـەی حـەقخوازی ئـەکتیفـو چـالاکی هەیـەو سـەبارەت بـە چاکسازی کۆمەڵگەکەی هەست بە بەرپرسیارێتی دەکات، بـەڵام لـە هـەمان کاتـدا خوتخوتـەو ورکەی خەمی ئاینیو چاکسازی فیکـری دینـیو لـەناو نەچوونی بۆچـــــوونە ئیمانییـــــەکانی خەڵکیەتی.

ڕۆشـنبیری ئـایینی خـۆی لـە بەرامبـەر دروشـمو شـەعائیرە ئاینییـــــەکانو بۆچـــــوونە ئیمانییەکانـــدا بـــە پابەنـــدو بەرپرســـیار دەزانێـــت، ئـــەو دەیـەوێت ڕۆشـنگەری ئـایینی ئـــەنجام بـــداتو لـــەپاڵ سـودمەندبوون لـە دەسـتکەوتە فیکریـەکانی خـۆیو بیرمەنـدانی دیکـەی جیهانـدا، لـە دروشـم و شـەعائیرە ئایینییـەکان ئیلـهام وەربگرێـت، بـۆ ئـەوەی بـە چەکێکی کاریگەرترەوە خەریکی چاکسازی بێت.

ڕۆشـنبیری ئـایینی ڕووبـەڕووی هـەموو ئـەو دابو نـەریتو بـەها ناپەسـەندو بیدعـەو داهێنـراوو دروســـــتکراوانە دەبێتـــــەوە، هەروەها ڕووبەڕووی هـەر جـۆرە لێکدانەوەیـــەکی شـــێوێنراویش دەبێتـەوە کـە زیـان بـە بـزاوتو ڕەسـەنایەتی مـرۆڤ بگەیـەنێتو مافە خوا پێدراوەکانی مـرۆڤ لـە کۆمەڵگـــەدا پێشـــێل بکـــات، هـــەروەها ڕێگـــەی چاکســـازی کۆمەڵگەش دەگرێتەبەر.

ڕۆشـنبیری ئـایینی خـۆی لـە بەرامبـــەر خـــواو لەپاشـــاندا لەبەرامبـــەر خەڵکیـــدا بـــە بەرپرسیار دەزانێت، هـەر بۆیـە تیۆریاو بۆچوونەکانی ئـەو نـەك تـــەنیا لەســـەر بنـــەمای عەقلانیـــــەتی خـــــودو دەستکەوتەکانی عەقڵی گشتیو مرۆیی لە کۆمەڵگەکانی دیکـەدا

ڕۆشنبیری
ئایینی فراوانی
بۆچوونەکانی
خۆی لە
چوارچێوەی
عەقڵ و ژیری
قسەی مرۆڤدا
کورت
نەکردووەتەوە
، بەڵکو دامێنی
ئەوی تا
(عەقلانیەتی
بالاتر لە مرۆڤ)
واتە
فەرموودەی
خوا بەرز
کردووەتەوە و
ڕادەکێشێت

بە شێوەیەکی ڕەها دامەزراوە، بەڵکو پڕ چەکە بە ژیری و عەقڵی تەواوو کەلامو (وەحی) خواییەوە، واتە ڕۆشنبیری ئایینی فراوانی بۆچوونەکانی خۆی لە چوارچێوەی عەقڵو ژیری قسەی مرۆڤدا کورت نەکردووەتەوە، بەڵکو دامێنی ئەوی تا (عەقلانیەتی بالاتر لە مرۆڤ) واتە فەرموودەی خوا بەرز کردووەتەوەو ڕادەکێشێت، تاوەکو بە ئاگاداربوون لەم (عەقلانیەتە بێ کەموکورتییە) خەریکی پێشکەشکردنی بۆچوونەکانی خۆی بێت.

بەڵگەنەویستە کە لەم بارودۆخەدا ڕۆشنبیری ئایینی دەتوانێت بۆچوونگەلێك پێشکەش بکات کە تەباو هاوئاهەنگ بن لەگەڵ فیترەتی بوونی مرۆڤ و پێداویستییە دەروونیەکانیدا، کە ئەنجامی ئەم کارەش کارایی ئەم تیۆریاو بۆچوونانەیە لە نێو کۆمەڵگەداو بەسوودبوونی بۆ مرۆڤگەلێکە کە ئایین بەشێکە لە بەها بنەڕەتییەکانیان و تەبایە لەگەڵ فیترەت و سروشتی مرۆڤایەتیدا.

مرۆڤەکان بۆیە باوەڕو ئیمان دەهێنن بۆ ئەوەی ئاسایش و ئاسودەیی بەدەست بهێنن، بۆ ئەوەی بۆ خۆشبەختی خۆیان لە هەردوو جیهاندا گرەنتییەك بەدەست بهێنن، ڕۆشنبیری ئایینی بە ئاگاداربوون لەم هەستیارییە سروشتیە لە مرۆڤەکاندا لە نێو کۆمەڵگەدا هەنگاو هەڵدەگرێت، واتە بە ئیلهام وەرگرتن لە کەلامی خواو بنەمای ئیمان، بۆچوونگەلێك پێشکەش دەکات کە لە هەمانکاتدا ڕێگەی گەشەکردنی فیکری و زیادبوونی تێڕوانینی زانستی کۆمەڵگە دابین دەکەن، هەروەها ئارامی و ئاسایشی دەروونی و خۆشبەختی تاکەکان لەخۆ بگرێت.

ڕۆشنبیری ئایینی بەم شێوازە لە پشتپێبەستندا سەرکەوتووانەتر لەو ڕۆشنبیرانە کار دەکات کە هەڵهاتنێکی خێراو بێ وەلامیان هەیە بۆ گرنگترین لایەنی ڕەسەنایەتی بەخش و جەوهەرو کرۆکی مرۆڤەکان، واتە کەسانێك کە ئیمان لە هاوکێشە فیکرییەکان و لە ڕۆشنگەریدا لەبەر چاو ناگرن، لە کاتێکدا دەیانەوێت بۆ قەیرانەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ڕێگە چارەیەك پێشکەش بکەن، کە زۆربەی پێداویستییە فیتری و سروشتییەکانی مرۆڤ دەشارنەوەو بەم جۆرە بارودۆخی قەیراناوی کۆمەڵگەکان قەیراناوی تر دەکەن و مرۆڤ لە سروشت و فیترەتی ڕەسەنی خۆی دوورتر دەخەنەوە.

***

سەرچاوە/ کتێبی (روشنفکر و هویت) نووسینی: (ئابتین ئەمیری)



# ژیان فێری کردم

جەمال غەریب حەمە

کەسێك دەڵێت (ژیان مامۆستایەکی مەزنە، بەڵام بەداخەوە هەموو قوتابییەکانی دەکوژێت)، کەسێکی تریش دەڵێت: (ئەو کەسەی دایك و باوکی تەربێتی نادادەن، ئەوا ڕۆژگار تەربێتی دەدات)، گرنگ وەرگرتنی وانەیە لەکاتی خۆیدا نەك لەکاتی بەسەرچوودا، بەڵام بە بڕوای من ئەمڕۆ کەمن ئەو کەسانەی لەکاتی خۆیدا وانە و ئەزموون لە ژیان وەردەگرن، ئاخر ژیان بە هەموو پێشهاتەکانییەوە بۆ خودی مرۆڤ هەلە، هەر هەڵە و کەمتەرخەمییەك لەو بارەوە هەڵەیەکی کوشندەیە، چونکە هەموو جارێك ئەو هەلانە دووبارە نابنەوە.

**(کتێب)**

لە هەر شوێنێك ژیان هەبوو پێویستە کتێبیش هەبێت.

بەنرخترین دیاری لای من کتێبە.

من بەردەوام یەك هاوڕێم هەیە کە ئەویش کتێبە.

ئەگەر حەز دەکەیت هاوڕێیەکت نیشان بدەم کە هەرگیز لێك زویر نەبن یان نەتبات بەسەر هەڵەدا و کاتت بەفیڕۆ نەدات و هەردەم لێی سوودمەند بی، ئەوا هاوڕێیەتی ئەو شتە بکە کە ناوی (کتێب)ە.

**(دایك)**

تۆ ئەگەر بەدوای بەدەست هێنانی بەهەشتیت، ئەوا لە ژێرپێی دایکتدا بۆی بگەڕێ.

دایك ئەو دروستکراوە مەزنەیە، کە نیشتمان بەو گەورەیی و پیرۆزییەی خۆیەوە هەڵگری نازناوی دایکە.

**(لێبوردەیی)**

- لێبوردەیی خەسڵەتێکی زۆر مەزن و بەرزە، بۆیە زۆر کەس دەستی نایگاتێ.
- ئای لێبوردەیی چەند گەورەی، کەچی نەیارەکانت بە بچووکی و ترس و پاشەکشە پێناسەت دەکەن.
- لێبوردەیی گەورەییە و تۆڵەش مافە، کەچی هەموومان حەزمان لە تۆڵەیە و خۆشمان بە گەورە دەزانین.
- هەموو تاوانێك سزای بۆ دانراوە، لێبوردەییش خەسڵەتێکی جوانە.

**(قەڵەم)**

- قەڵەم ئەو چەکە کاریگەر و سەردەمیانەیە کە هەڵگرەکەی یان بەندیخانە و هەڵهاتن و لەناوچوون چاوەڕێیەتی یان پارە و پلە و پایە، وێنەی کەسی یەکەمیان زۆر دانسقە و پڕ بایەخن، بەڵام وێنەی کەسی دووەمیان وەك گەڵای دار زۆر و بێ بایەخن.

**(درۆزن)**

— درۆزنەکان ژیانی ئاسایی خەڵکیان شێواندووە.

— سوپاس بۆ ئەو درۆزنەی کە ڕۆژانە لێیەوە فێری درۆناسی بووم.

— درۆزن خاوەنی کەسایەتییەکی بێ نرخە، دە تۆش خۆتی لێ بپارێزە، چونکە ئاوازی درۆ و ڕەنگی درۆزن دیارە.

## (هەڵبژاردن)

— هەڵبژاردن شۆڕشێکی یاسایی و جەنگێکی مەدەنیانە و کودەتایەکی سپی خاوێنە.

— گەل پێویستە لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا بڕیاری خۆی بدات و دەسەڵاتیش دوای هەڵبژاردن، بەپێچەوانەوە نە هەڵوێستی گەل دوای هەڵبژاردن و نە بەڵێنی دەسەڵاتیش پێش هەڵبژاردن هیچ ئەرزشێکیان نییە و نابێت.

## (یاسا و هێز)

— یاسا و هێز تەواوکەری یەکترن، چونکە یاسا بەبێ هێز ناتوانێت دەست ببات بۆ هیچ و هێزیش بەبێ یاسا دەست دەبات بۆ هەموو شت.

## (ڕۆژنامەنووس)

— ئەگەر لە ڕابردوودا شانۆ قوتابخانەی گەل بووبێت، ئەوا ئەمڕۆ ڕۆژنامەنووسی ئازا و ڕاستگۆ مامۆستای گەل و چاوی جەماوەر و زمانی هاوولاتی و ویژدانی کۆمەڵگەیە.

## (جیاوازییەکان)

— ئەهرامی فیرعەونەکان لە باخچەی کۆشکەکانی سەرکردەکانی ئێمەدا جێگەیان دەبێتە، لە کاتێکدا ئەوان بانگەشەی خوایەتی و ئەمان بانگەشەی شۆڕشگێڕی دەکەن.

— ئێمە هەردەم لە هەوڵی بێ ئەرزشکردنی کاری ئەوانی تر و سەرسامیشین بە کارەکانی خۆمان.

— ئەگەر زوڵمی کەسێکی ئاسایی شایستەی هەڵوێست و کاردانەوە بێت، ئەی بۆ زوڵمی دادپەروەرێك دەڵێی چی؟

## (ڕاستی و درۆ)

— ئەگەر درۆ لە دواڕۆژدا سزای لەسەر بێت، ئەوا ڕاستگۆیی هەر لە ژیاندا باجەکەی لەو کەمتر نییە.

— جیاوازی نێوان ڕاستگۆ و درۆزن لەوێدایە، ڕاستگۆ ئەگەر درۆش بکات هێشتا هەر باوەڕی پێ دەکەن، بەڵام درۆزن ئەگەر ڕاستیش بڵێت هێشتا بەگومانن لێی.

## (جیاوازییەکە لێرەدایە)

— ئەگەر کەسێك خراپەی لەگەڵدا کردیت تۆش بەهەمان شێوە بەرپەرچت دایەوە ئیتر جیاوازیتان چییە، یان ئەگەر بەرانبەرەکەت چاکەی لەگەڵدا کردیت، تۆش وەك ئەوت کرد ئەوەش ئازایەتی نییە، بەڵکو ئازایەتی و جیاوازییەکە لەوێدا دەردەکەوێت، کە بەرامبەرەکەت خراپەی لەگەڵدا کردیت تۆش هەمان کاردانەوەت نەبێت.

## (ئازاری ویژدان)

— ئازاری ویژدان لەگەڵ سەرجەم ئازارەکانیتر وەك دوو تای یەك تەرازوو وان، هەڵکشانی هەر کامیان واتە داکشانی ئەوی تریان.

— لەسەردەمی ئەمڕۆماندا هەموو ئازار و دەرد و و نەخۆشییەکان لە هەڵکشانی بەردەوام و تۆمارکردنی ژمارەی پێوانەیدان، تەنیا ئازارێك نەبێت لە کۆتایی لەناوچووندایە، ئەویش ئەو دەردەیە کە پێی دەڵێن (ئازاری ویژدان).

## (درووستکراو)

— زۆر نەشیاوە درووستکەر لاواز بێت لەبەرامبەر دروستکراوەکەیدا، تۆ سەیرکە مرۆڤ خۆی درووستکەری پارەیە و کەچی چەند لاوازە لە بەرامبەریدا.

## (ئەخلاق)

— لە هەر کارێکدا ئەگەر

ڕەچاوی ئەخلاق نەکرا ئەوە نادادپەروەری دێنێتە کایەوە.

### (شۆڕش)

– گرنگترین و پیرۆزترین و گەورەترین شۆڕش ئەوەیە کە گۆڕانکاری پۆزەتیڤانە لە هزری کۆمەڵگەدا بکەیت.

### (کاتژمێر)

– کاتژمێر کار نەکات باشترە لەوەی کە کاری کرد پاش و پێش بکات.

### (مرۆڤی بچووک)

– مرۆڤە بچووکەکان چێژ وەردەگرن لە ئازاری بەرامبەر و ئازاریش دەچێژن لە چێژی بەرامبەر.

### (گومان)

– من بەگومانم لە هەموو کەس و هەموو شتێك تا دەگەمە یەقین.

### (ژیان)

– ژیان لای ئێمە لە گەمەیەك زیاتر نییە، ئەویش هەر لە سەرەتاوە دۆڕاندوومانە.

– کە ژیان بێ ئامانج بو ئیتر مرۆڤ چی بۆ دەمێنێتەوە.

– ژیانی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی لەسەر سێ کوچکەی بەرژەوەندی و ساختە و هێز وەستاوە.

– ژیان زۆر کورتە، بەڵام پاداشتەکەی نەبڕاوەیە.

### (هاوکاری)

– هەوڵ بدە ڕۆژانە هاوکاری کەسانێك بکەیت، ئەگەر کەسە نزیکەکانی خۆشت بن، چونکە پاش کارەکە هەست بە ئاسودەیی دەکەیت.

– ئەگەر ناتوانیت هاوکاری خەڵکی بکەیت، خۆ دەتوانی ڕێزیان لێ بگریت.

### (عەدالەت)

– لەم سەردەمی ئەمڕۆدا کەس ناتوانێت عەدالەت بەرجەستە بکات.

### (وتە و کردار)

– هەرچەندە خۆت ماندوو بکەیت کەسێك نادۆزیتەوە کە وتە و کرداری هاوتەریبی یەك بێت.

### (گەندەڵی و چاکسازی)

– ئەوە بزانە هەردەم لایەنگرانی گەندەڵی زۆرترن لە هەوادارانی چاکسازی، بۆیە هەرگیز نابینیت کە هەوادارانی چاکسازی سەرکەون بەسەر لایەنگرانی گەندەڵیدا.

### ( جۆرەکانی بەرپرس)

– دووجۆر بەرپرس هەیە، جۆرێکیان هێندە گەورەن کورسییەکەی ژێریان بچووکە وەك پێڵاوەکانیان، جۆری دووەم هێندە بچووکن لە پشتی کورسییەکانیانەوە گوم دەبن.

### (سنووری ئازادی)

– ئێمە سنووری ئازادی بەرامبەر باش دەزانین، بەڵام ڕازی نابین هیچ کەس سنووری ئازادی خۆمانمان نیشان بدات.

### (مرۆڤ)

– ئەسڵ لە مرۆڤەکاندا هەوەسبازی و خۆپەسەندی و خۆسەپێنییە، ئەوە ئاین و یاسا و عورف و ویژدانە کە هەموو حەز و ئارەزووەکانی مرۆڤیان سنووردار کردووە.

### (جۆرەکانی کوشتن)

– دووجۆر کوشتن هەیە (جەستەیی و مەعنەوی) جۆری یەکەمیان ئەو جۆرەیە ئاساییە کە لە ئەجەلدا کورت دەبێتەوە، بەڵام جۆری دووەم کە کوشتنی مەعنەوییە دڵنیابن ئازارەکەی هیچی کەمتر نییە لە جۆری یەکەم، چونکە تا ژیان بەردەوام بێت ئازاری ئەم کوشتنەش بەردەوام دەبێت، واتە هەر ڕۆژێکی مردنێکە.

### (حەقیقەتی ڕەها)

– لە ئاریشەی نێوان مەردوومەکاندا حەقیقەتی ڕەها لای کەسیان نییە، بەڵکو دەشێت هەر لایەکیان ڕێژەییانە بەشێك لە ڕاستی و ناڕاستیان لابێت.

### (یاسا)

–یاساکان زۆر بێ بەزەیین.



# ئێمە و کێشەکان

ئەیوب کوردی

ئێمە مرۆڤین، خوای گەورە دروستی کردووین و لە ژیان و زەویدا گوزەر دەکەین، ئەندازە و پێوانەی مانەوە و بوونمان بۆ کێشراوە، هەر لە هاتنمان بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی و گوزەرکردنمان بەناو یەکە یەکەی کایەکانی سەر ئەم زەمینە ئاشناییمان بۆ دەستنیشان دەبێت و دەبێتە کانگای ناسین و مامەڵەکردن و هەڵسوکەوتمان، جا لەم هەلومەرجەی ژیانماندا زۆرێك لە کایەکان بە درێژایی ژیانمان زۆر تا کەم لەگەڵ یەکتردا یەکانگیر دەبیت و بگرە هەندێکیشیان لەم کایانە لە بیر و هزری خۆماندا بوون و هاوسەنگ کردنیان مەحاڵ دەبێت و بەڵام نازانین لەدیوە شاراوەکەی ئەم کایانە چی دەگوزەرێت؟ و چۆن مامەڵەمان لەگەڵ دەکات؟ کەواتە پەلەکردنمان بۆ دۆزینەوەی هاوسەنگی دیوێکی دیاری کایەکە لەوانەیە بەرئەنجامەکەی بە دڵی ئێمە نەبێت، لەوانەیە چۆنیەتی مامەڵەکردنمان زیانی زیاتری هەبێت لەوەی قازانج، جا ئێمە چۆن پەی بە هەردوو دیوی کایەکە بەرین بۆ هاوسەنگی، بۆ ئەوەی سەرەنجامی دووربوون لە کێشە و گۆڕینی کێشەکان بە تای ئارامی بەشی ئێمە بێت، کەواتە هەموو ئەوانەی لە ژینگەی ئێمە ڕوو دەدەن و دەبن بە بەشێك لە ژیانمان و ئەرکی مامەڵەکردنمان دەکەوێتە ئەستۆ، یان وەکو سێبەر لە ڕۆژەتاوا بە دیارمانەوەن و لەباراندا وەکو سەیوان بەسەرمانەوەن، پەی بەوە دەبەین ڕێ لە ئەندازە و

قەبارەی گەورەبوونی کێشەکان بگرین، نەهێڵین جگە لە وتە و درێژی و پانی و قەبارە دیاریکراوی کە کێشەکە هەیەتی هیچی تری بۆ زیاد نەکرێت، چونکە کێشەکان چەند بچووك بێتەوە چارەسەری بچووکی ئاراستە دەکرێت، چەندیش فراوان و گەورە بکرێت هیوای چارەسەرکردنی لای ئێمەی خاوەن کێشە مەحاڵ و قورس دەبێت و هەڵوەستە لەسەرکردنیان بە بێ سوود و قازانج و زیان یەکلایی بێتەوە و نەهێڵین ئەوەندە لە کانیاوی بیر و هزردا بهێڵدرێنەوە، چونکە مانەوەی کێشەکان ئارامیمان لێ دەسەنێتەوە و ئاڵۆزبوونی مێشکمان بەرئەنجامی دەبێت، کە ئەمەش لەوانەیە سەرئەنجامێکی خراپ و پەشیمانییەکی لە بن نەهاتوومان پێشکەش بکات و ئەوەی دەبێت بزانین ئەوەیە کە ئارامی خۆمان و خۆشبەختی خۆمان گرینگترە لە قەبارەی کێشەکان، چونکە ساتێك ئارامی ونبوون و ئاوابوونی تەواوی کێشەکانی ژیانە، وەك ئەوەی (مەسعوود لەعلی) لە پەرداخی کێشەکاندا نموونەیەکی ناوازە دەهێنێتەوە کە (کاتێك مامۆستایەك لە دەسپێکی وانەکەیدا پەرداخێکی پڕ لە ئاوی بەدەستەوە گرت و بەرزی کردەوە تاوەکو هەمووان ببینن، دوایی لە قوتابییەکانی پرسی ئەم پەرداخە کێشی چەندە؟ قوتابییەکان گوتیان : 50 غرام، 100 غرام، 150 غرام... مامۆستاکە گوتی بەبێ کێشان نازانم کێشی تەواوی چەندە؟ بەڵام پرسیار ئەوەیە: ئەگەر پەرداخەکە چەند خولەکێك بە دەست بیگرم چی ڕوودەدات؟ قوتابییەك گوتی هیچ. مامۆستا گوتی ئەگەر کاتژمێرێك هەروا بیگرم؟ قوتابییەك گوتی دەستتان وردە وردە ئازاری تێ دەکەوێت، مامۆستا گوتی ئەدی ئەگەر یەك ڕۆژی تەواو بەدەستمەوە بێت؟ قوتابییەکان گوتیان دەستتان سڕ دەبێت و ماسولکەکانتان بەتوندی فشاریان دێتە سەر و شەلەل دەبن و لە کار دەکەون، مامۆستاکە گوتی زۆر باشە لەم ماوەیەدا کێشی پەرداخەکە زیاد و کەمی کردووە؟ گوتیان نەخێر.

مامۆستاکە گوتی کەوابوو چ شتێك دەبێتە هۆی ئازار و فشار و نەخۆشی ، من دەبێ لە بەرامبەردا چی بکەم؟ قوتابییەکان سەریان سوڕما،



قوتابییەك گوتی پەرداخەکە دابنێ.

مامۆستاکە گوتی کێشەکانی ژیانیش بەم شێوەیەن، ئەگەر چەند خولەکێك لە بیر و هۆشدا بهێڵدرێنەوە کێشە نابن، ئەگەر ماوەیەکی درێژتر بێت ئازارتان دەدات، ئەگەر زیاتر بێت توانای ئەنجامدانی کارتان نامێنێ و لە کار دەکەون).

ئێمەی مرۆڤیش ئەوەمان لا گرینگە کە کێشەکان بە گرینگ بزانین و کەمترین ماوەیان بۆ ڕاگرتن و مانەوەیان بدەینێ، بۆ ئەوەی کەمترین ماوە لەژێر دەسەڵات و فشارین بمێنینەوە، نەبن بە کۆسپێکی هەمیشەیی و ڕێگەی ئەنجامدانی بیرکردنەوەی تازە و ژیانی تازەمان لێ بگرن، چونکە دواجار خۆمان دەبین بە قوربانی کێشەکان و دەبینەوە بە کێشە، کە ئەمە دواجار دوو چارەسەری پێویستە: یەکێکیان بۆ خۆمان و ئەوی تریش بۆ کێشە.



# دەستەی گشتی دەسپاکی لە کوردستان و دەسەڵاتەکانی

د. مەریوان صابر حەمەد/ سەرۆکی بەشی یاسا لە زانکۆی سەڵاحەددین



بایەخدان بە بابەتی بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی یەکێکە لە گرنگترین سیما جیاکەرەوەکانی سیستەمی وڵاتان لە سەردەمی ئێستاماندا، بۆیە دەبینین لەسەر هەردوو ئاستی نیشتمانی و نێودەوڵەتی پرسی بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی بە هەستیارترین پرس دادەنرێت لە سیستەمی یاسایی وڵاتان. لە ئاستی نیشتمانیدا، وڵاتانی جیهان پێداچوونەوەیەکی تەواویان بۆ دامەزراوەکانی خۆیان کردووە بە مەبەستی پێکهێنانی چوارچێوەیەکی یاسایی پتەو بۆ بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی. لە ئاستی نێودەوڵەتیشدا، دەیان ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی مۆرکراوە کە ئەم پرسە بە پرسێکی نێودەوڵەتی دەناسێت و میکانیزمی یاسایی دیاری دەکات بۆ هاریکاری نێودەوڵەتی بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی.

لەسەر ئاستی کوردستانیدا، لە ڕوانگەی ئەو ڕاستییەی کە کوردستان بە یەکێک لەو شوێنانەی جیهان دادەنرێت کە دیاردەی گەندەڵی تێیدا لە ئاستێکی بەرزدایە، ڕادەی دامەزراوەیی لە بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی وەکو پێویست نییە، یاسای دەستەی گشتی دەسپاکی ژمارە (3) لە ساڵی (2011) لە کوردستان وەکو هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی ڕیفۆرم و بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی لە دامودەزگاکانی کوردستان دەرچوو، لە هۆیەکانی دەرچوواندنی یاساکەشدا هاتووە: "گەندەڵی دارایی و کارگێڕی کە تووشی حکومەت و کۆمەڵ دەبێت، دەبێتە مایەی هێنانە ئارای حاڵەتێك لە پاشکەوتن و بێدادی لە نێو کۆمەڵدا، ئەمەش وای لە حکومەت و گەلانی پێشکەوتوو و شارستان کرد یاسا دەربکەن تا سنوورێکی بۆ دابنێن و نەیهێڵن و لە ناوی ببەن و لەبەر بایەخی ڕۆڵی چاودێری بەسەر دەسەڵاتەوە، کە بە کۆڵەکەی بنەڕەت لە سیستەمی دیموکراسی ڕاستەقینە دادەندرێت و لەبەر ئەوەی نەهێشتنی گەندەڵی لە هەموو ئاستەکاندا پێویست بە هەبوونی دەستەیەکی گشتی دەسپاکیی دەکات و لە ژێر چاودێری پەرلەماندا بێت و ئەو پسپۆڕایەتی و دەسەڵاتەشی پێ بدرێت کە ئەرکی پێ سپێردراوی دەیخوازێت، ئەم یاسایە دانرا".

بە ڕای ئێمە یاسادانەری کوردستانی سەرکەوتوو بووە لە دەرکردنی ئەم یاسایە کە وەکو بەشێك لە پابەندبوونی کوردستان بە ڕێککەوتنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ

بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی دێت، لەبەر ئەوەی ئامادەباشی کوردستان بۆ گونجاندنی یاساکانی بە پێی ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان بە شێوەیەك کوردستان دەردەخات کە خاوەنی دامەزراوەی پێویستی خۆیەتی بۆ بوون بە دەوڵەت.

لە هەمان کاتدا، ئەوەی جێگای هەڵوەستە کردنە سستی لایەنە جێبەجێکارەکانە لە پێکهێنانی ئەم دەستەیە، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر بەسەر دەرچوونی ئەم یاسایە تا ئێستا ڕێ و شوێنی پێویست نەگیراوەتە بەر بۆ دروست کردنی ئەم دەستەیە.

پێکهێنانی دەستەی گشتی دەسپاکی لە کوردستان زەرورەتێکی یاساییە، کە پێویستە بە زووترین کات بە پێی یاسا ئەم دەستەیە دابمەزرێندرێ بۆ ئەوەی کوردستان پابەندبوونی بە ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی پیشان بدات

خوێندنەوەی ئێمەش بۆ ئەم یاسایە لە چەند تەوەرێکەوە دەبێت:

**یەکەم/ شێوازی دەستنیشانکردنی سەرۆکی دەستە:**

بە پێی ماددەی شەشەم لە یاسای دەستەی گشتی دەسپاکی پرۆسەی دەستنیشانکردنی سەرۆکی دەستە بە مەرسوومێکی سەرۆکی کوردستان دەبێت دوای پیادەکردنی ئەم دوو قۆناغە:

**قۆناغی یەکەم:** دەسەڵاتی دادوەری (3) کەسایەتی کاندید دەکات لە نێو ئەو کەسانەی کە مەرجە یاساییەکانیان تێدایە و داوایان پێشکەش کردووە بە دەسەڵاتی دادوەری لە ماوەی یاسایی.

**قۆناغی دووەم:** پەرلەمانی کوردستان لە ڕێگای دەنگدانی نهێنی و بە زۆرینەی دوو لەسەر سێی ئەندامانی پەرلەمان لە نێو ئەو سێ کاندیدە کەسایەتییەك هەڵدەبژێرێت بۆ وەرگرتنی پۆستەکە.

بە ڕای ئێمە ئەو میکانیزمە یاساییەی دیاری کراوە بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی دەستە سەربەخۆیی دەستە بەهێز دەکات، چونکە دەسەڵاتی جێبەجێکردن هیچ ڕۆڵێك نابینێت لەم پرۆسەیەدا، ئەمەش وا دەکات لە چاودێری کردنی دەستە بۆ کارەکانی حکومەت هیچ سڵ نەکرێتەوە و لە ژێر کاریگەری حکومەت نەبێت. هەروەها کاندید کردنی کەسایەتییەکان لە لایەن دەسەڵاتی دادوەری دەبێت کە دەسەڵاتێکی سەربەخۆیە و پێوەری بابەتیانە پەیڕەو دەکات لە کاندیدکردنی



لەسەر هەردوو ئاستی نیشتمانی و نێودەوڵەتی پرسی بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی بە هەستیارترین پرس دادەنرێت لە سیستەمی یاسایی وڵاتان

کەسایەتییەکان.

**دووەم/ دەسەڵاتەکانی دەستەی گشتی دەستپاکی:**

دەستەی گشتی دەسپاکی کۆمەڵێك دەسەڵاتی پێ ڕاسپێردراوە کە بریتین لە:

1. جێبەجێکردن و پیادەکردنی یاساکانی بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی و پێوەرەکانی ڕاژەی گشتی بە پێی دەستوور و یاسا بەرکارەکانی وڵات.
2. لێکۆڵینەوە کردن لە دۆسیەکانی گەندەڵی و ئیحالە کردنیان بۆ دادگای تایبەتمەند و

بەدواداچوونیان.

3. وەرگرتنی شکایەتەکانی هاوولاتییان لەبارەی تۆمەتەکانی گەندەڵی.

4. بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیرییەکی نیشتمانی بۆ بەرزکردنەوەی ئاکارەکانی دەسپاکی و پابەند بوون بە پێوەرەکانی ڕاژەی گشتی.

5. دەرکردنی ڕێنمایی دەرخستنی ماڵ و موڵکی بەرپرسان بۆ خەڵك.

لە کۆتاییدا، پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە دەستەی دەسپاکی -لەو کاتەوەی کە بە فەرمی بە پێی یاسا پێك دەهێنرێ- بە تەنیا ئەرکی بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی ناکەوێتە ئەستۆ، بەڵکو جۆرێك لە تەواوکاری دەبێت لە نێوان دەستە و کۆمەڵێك دامەزراوەی دیکەی وڵات لەم بارەیەوە، لەوانە دادگاکان و دەستەی چاودێری دارایی و دەستەی داواکاری گشتی. لە پاڵ ئەو دامەزراوە فەرمیانەش، نابێت ئەوە لە یاد بکەین کە ئەرکێکی گەورە دەکەوێتە ئەستۆی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و دەزگاکانی ڕاگەیاندن تا ئەوانیش ڕۆڵی خۆیان ببینن بە ڕۆحێکی نیشتمانپەروەرانە بۆ کەم کردنەوەی دیاردەی گەندەڵی لە وڵات.




**یاسای دەستەی گشتی دەسپاکی ژمارە (3) لە ساڵی (2011) لە کوردستان وەکو هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی ڕیفۆرم و بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی لە دامودەزگاکانی کوردستان دەرچوو**

**سێیەم/ ڕەگەزەکانی سەرکەوتنی دەستەی دەسپاکیی گشتی:**

سەرکەوتنی دەستەی گشتی دەسپاکیی لە کارەکانی پێویستی بە فەراهەم بوونی کۆمەڵێك ڕەگەز هەیە کە گرنگترینیان:

1. بوونی ئیرادەیەکی سیاسی ڕاستەقینە لای سەرکردەکان و باوەڕبوونیان بە پێویستی بەرەنگاربوونەوەی دیاردەی گەندەڵی بە شێوەی دامەزراوەیی و پشتگیریەکی سیاسی بەهێز لە ئاستە باڵاکانی وڵات بۆ ئەم دەستەیە دابین بکرێت.

2. دارشتنی یاسایەك بۆ دەستەکە کە دەسەڵاتی لێکۆڵینەوەی پێ بدات لەگەڵ هەر بەرپرسێکی وڵات -لە هەر ئاستێکدا بێت- کە لە تاوانێکی گەندەڵی تێوە گلاوە.

3. دەستنیشانکردنی کەسانی سەربەخۆ و جێگای باوەڕ و متمانە کە بەناوبانگن بە ئاستێکی بەرزی دەستپاکی بۆ وەرگرتنی پۆستەکانی دەستە.

4. فەراهەم کردنی توانستە مرۆییەکان و پێویستە داراییەکان کە لەگەڵ ئەو ئەرك و بەرپرسیاریەتیانە گونجاوبن کە بە دەستە ڕاسپێردراون.

5. دارێشتنی کۆمەڵە یاسایەکی جیا کە دەبنە پشتگیری بۆ کاری دەستە، لەوانە: یاسای دەستکەوتنی زانیاری و یاسای دەرخستنی ماڵ و موڵکی بەرپرسان بۆ خەڵك و بەدواداچوونی زیادبوونی ئەو ماڵ و موڵکە لە لایەن دەستە و لێکۆڵینەوەکردن تێیدا.

لە کۆتاییدا دەڵێین، پێکهێنانی دەستەی گشتی دەسپاکی لە کوردستان زەرورەتێکی یاساییە، کە پێویستە بە زووترین کات بە پێی یاسا ئەم دەستەیە دابمەزرێندرێ بۆ ئەوەی کوردستان پابەندبوونی بە ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی پیشان بدات کە بە پێی ئەم ڕێکەوتننامەیە پێکهێنانی دەستەی تایبەتمەند بە بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی داوایەکی سەرەکیە، دامەزراندنی ئەم دەستەیەش لە کوردستان پێویستە بە شێوەیەك بێت کە لە هەموو ڕەهەندێکی سیاسی دوور بخرێتەوە.

# ڕۆڵی پاراستنی بەکاربەر ( حمایە المستهلك)

## لە بازاڕەکانی هەرێمی کوردستاندا

هەرێمی کوردستان لە پاش ئازادبوونی عێراق کرانەوەیەکی بەرچاوی لەبواری ئابوری و بازرگانی بەخۆیەوە بینی, دەرگاکانی بازرگانی نێودەوڵەتی بەڕوویدا کرایەوە, بەو هۆیەوە هاتنی زۆرێك لە بازرگانان و وەبەرهێنەرەکانی بیانی بۆ هەرێمی کوردستان و بەستنی پردی پەیوەندی بازرگانی لەنێوان بازرگانانی ناوەخۆ و دەرکی، سەبارەت بەم کرانەوە بازرگانییەشەوە هەرێمی کوردستان وەکو بازاڕێکی جێی بایەخ لەلایەن بازرگانان دەستنیشان کرا, ئەمەش بووە هۆی هاوردەکردن و ساخکردنەوەی زۆرێك لە کاڵا و پێداویستییە بیانییەکان لە خۆراك و دەرمان و پێداویستییە سەرەکییەکانی تاك لە هەرێمی کوردستاندا, لەهەمان کاتدا بەهۆی نەبوونی هۆشیاری و زانیاریی بازرگانیی, سەبارەت بە بوونی ئاستی باشی و کوالێتی و تۆکمەیی بەپێی پێوانەی نێودەوڵەتی (ایزو) لەو کەلوپەل و پێداویستییانەی هاوردەی ناوەخۆ دەکرێت, جۆرێك لە تێکەڵبوون و ناسەقامگیری رووی لە بازاڕەکان کرد، بۆیە بوونی دامەزراوەیەك بە زەرورەتێکی



محەمەد عەلی میران

پێویست دادەنرێت , بەناوی پاراستنی بەکاربەر (حمایە المستهلك). بۆ بەرچاوڕوونی کڕیار لەم سەردەمەدا, بەهۆی هاوردەبوونی زۆرێك لە پێداویستییە سەرەکییەکان، دامەزراوی پاراستنی ماف بەکاربەر (حمایە المستهلك) گرنگییەکی تایبەتی خۆی هەیە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی, کە ئەمەش ڕاڤەیەکی کارای چەمکی سەردەمیانەی ماف مرۆڤ دادەنرێت, گەر زیاتر لە چەمکی دامەزراوەی پاراستنی ماف بەکاربەر (حمایە المستهلك) ورد






**وەزیفەی دامەزراوی پاراستنی مافەکانی بەکاربەر جگە لە پاراستنی کەسایەتی بەکاربەر، کاری ئەو ڕێنمایی و یارمەتیدانی تاکەکانی کۆمەڵگەیە بە (کڕیار و فرۆشیارەوە)، هەروەها دابینکردنی کەشێکی دادوەرانەیە لەنێوان هەردوو لا و هەوڵدانە بۆ نەهێشتنی کاری بازرگانیی نایاسایی**

بینەوە، دەبینین کە چەمکی پاراستن (حمایە) بریتییە: لەو هەوڵ و کۆششانەی کە لەلایەن حکومەت و ڕێکخراو و کۆمەڵە جۆربەجۆرەکانی حکومی و ناحکومی دەدرێت وەکو (ڕێکخراوی کۆمەڵگەی مەدەنی)، کە ڕاپەڕاندنی کارەکانیان خۆبەخشانەیە و لە بەرژەوەندی هاوبەش و سوودی کڕیار بێت.

بەو کەسەش دەگوترێت بەکاربەر (المستهلك) کە هەڵدەستێت بەکڕین و بەکارهێنانی ئەو کەلوپەلانەی کە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی خۆی و خێزانەکەیەتی, بەمەبەستی سوود وەرگرتن و بەکارهێنانی, نەوەك دووبارە فرۆشتنەوەی وەکو پزیشکێك پێداویستی تەندروستی دەکڕێت بەمەبەستی بەکارهێنانی لە کارەکەیدا, نەوەك بە مەبەستی فرۆشتنەوەی, یان بازرگانێك هەندێ شت دەکڕێت بە مەبەستی بەکارهێنانی خۆی، نەوەك بۆ بازرگانی پێکردنی.

تەواوی پلانە سیاسی و یاسایی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان کۆکن لەسەر گرنگیدان و پاراستنی لایەنی کڕیار، بە مەبەستی تێنەکەوتن و زەرەر نەکردنی لە گرێبەستە بازرگانییەکاندا... مەبەستی ئەم دامەزراوە سازاندنی کەشێکی هۆشیارە لە ناو کۆمەڵگەدا و ناساندنی بە کۆمەڵێك زانیاریی بازرگانی لەڕووی چۆنییەتی و باشی و وریابوون لە ماوەی بەسەرچوونی ئەم کەلوپەلانەی کە دەخرێنە بازارەکانی هەرێمەوە....

بوون و وەزیفەی دامەزراوی پاراستنی مافەکانی بەکاربەر (حمایە المستهلك) تەنیا پاراستنی کەسایەتی بەکاربەر (المستهلك) نییە, تاکو دژایەتی کار و پیشەی بازرگانان و کۆمپانیاکان بکات لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەست و کڕین و فرۆشتنەکاندا، بەڵکو کاری ئەو ڕێنمایی و یارمەتیدەری تاکەکانی کۆمەڵگەیە بە (کڕیار و فرۆشیارەوە), هەروەها دابینکردنی کەشێکی دادوەرانەیە لەنێوان هەردوو لا و هەوڵدانە بۆ نەهێشتنی کاری بازرگانی نایاسایی.

# گرفتەکانی وشەڕۆنان و زاراوەی قامووسی لەمیدیای کوردیدا(1)

لە میدیاکانی هەرێمی کوردستاندا، جگە لەو گرفت و قەیرانانەی لە بواری ڕێنووسدا هەن، هەروەها چەندین گیروگرفت لە بواری ئیستاتیکی و وشەڕۆنان و زاراوە و وشەی قامووسیدا هەن، کە هەندێکیان ڕاستی و ناڕاستییان یەکلایی نەکراوەتەوە، هەندێکیشیان لە ڕابردوو و ئێستادا، لە لایەن زۆرێك لە شارەزا و زمانناسانەوە شێوازە ڕاست و دروستەکەیان پیشان دراوە، کەچی زۆر دەم شێوە بە هەڵە ناسێندراوەکە بەر چاو دەکەوێت.

## گرفتی تێکەڵبوونی هەندێ وشە و زاراوە

کۆمەڵێك وشە و زاراوە لە زمانی کوردیدا هەن، تەنیا لەبەر ئەوەی وێنە و شکڵی وشەکان لە یەك دەچن. بە بێ ئاگایی یا بە هەند نەگرتنی بابەتەکە، لێرەولەوێ تێکەڵ دەکرێن، ئەگەرچی بەپێی قامووسە کوردییەکان لە ڕووی مانا و مەبەستەوە ئەم وشە و زاراوانە تەواو لە یەك جوێن، لە نموونەی ئەو وشە و زاراوانەش:

1- **گەل و گەڵ:** ئەگەرچی تەنیا لە لامی کۆتایی وشەکەدا جوداوازییان هەیە، هی یەکەم لامی سووك و ئەوەی دووەمیش لامی قەڵەوە، کەچی هەندێ جار (گەل) بە (گەڵ) دەنووسرێت و هەندێ حاڵەتیش (گەڵ) دەکرێتە (گەل).

2- **هەل و هەڵە:** لێرەشدا دەبینین ئەم دوو وشەیە تێکەڵ دەکرێن، بەتایبەتی لەو کاتانەی وشەی (هەل) دەخرێتە ڕستەوە و پاشگری (ە)ی بۆ زێدە دەکرێت. بۆ نموونە لەباتی (قۆستنەوەی هەلەکە)، دەنووسرێت (قۆستنەوەی هەڵەکە)، یان ڕستەی (ئەو هەلە لە دەست مەدە) دەکرێتە (ئەو هەڵە لە دەست مەدە).

3- **پلان و پیلان:** زۆر جار کە باسی (پلان) دەکرێت، دەنووسرێت (پیلان). هەر وەك حاڵەت بووە (پلان) نووسراوە، کەچی مەبەست (پیلان) بووە.

4- **کولتوور و کەلەپوور:**



زیاد ڕەشاد قادر

لە چەندین کەناڵی ڕۆژنامەوانیدا بەر چاو کەوتووە، کە (کولتوور) خراوەتە شوێنی (کەلەپوور)، حاڵەتیش هەیە بە پێچەوانەوە (کولتوور) کراوەتە (کەلەپوور).

5- هەروەها چەندین وشە و زاراوەی دیکە، وەك ئەم چوار نموونەیەی سەرەوە تێکەڵ دەکرێن، بە تایبەتی کاتێ دەخرێنە ڕستەوە، کە دەشێ هەڵەی چاپ بن، وەك چۆن ڕێی تێ دەچێ هەڵەی ڕێنووس یا بێ سەلیقەیی بن، تەنانەت بە نەزانییش بێ، وەك:
(دیالێکت و دیالەکتیك)، (سونبول و سیمبوڵ)، (تیرۆر و

تیـۆر)، (یاسـایی و ئاسـایی)، (پـرس و پرسـە)، (ئـاونگ و ئـاورینگ)، (ئەسـتەم و ستەم)...

### شار و شارۆچکە و شارەدێ

زۆرێـك لـە میـدیاکانی ئێمـە، وشەی شار بەرانبەر (محافظة)ی عەرەبی دادەنێن، شارۆچکە بۆ (قەزا) و شارەدێ بۆ (ناحیە) بە کـار دێـنن. بـەڵام شـارەدێ و شارۆچـکە و شـار، بـۆ شـاری بچـووك (گونـدی زۆر گـەورە) و گەورە و گەورەتر بـە کـار دێـن، نـەك سـێ زاراوەی ئیـداری بـن. دەشێ شارێك زۆر گەورە بێ لـە ڕووی ڕووبـەر و چـڕی دانیشـتوانەوە، بـەڵام لـە ڕووی ئیدارییەوە تا ئێستا هەر ناحیە، یـا قـەزا بێـت و نەبووبێتـە پارێزگـا،[2] هـەروەك دەشـێ شـارێك بـەو ئەندازەیـە گـەورە نەبێ، وەلێ بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی، یا بڕیارێکی سیاسی بووبێتە پارێزگا، بۆیێ یا هەر وشەی قەزا و ناحیەکە بە کار ببردرێت، یـا هـەوڵی داڕێشتنی وشە و زاراوەی نوێی بۆ بدرێت. خـۆ ئەگـەر وشـەی (قـەزا و ناحیە) بە کار بهێندرێت، ئەوا هێشـتا لـە کێشـەکە ڕزگامـان نابێـت. بـۆ نموونـە کـە دەنووسرێت:

(ڕووداوێکی هاتوچۆ لە قەزای کۆیێ ڕوویدا)، یا (لە قەزای هەڵەبجە بۆمبێك دەتەقێتەوە)،

**(تەنیا) پێچەوانەی (تەنانەت)ە، (هەمیشە)ش پێچەوانەی (هەرگیز)، کەچی زۆر دەم لە شوێنی مانا پێچەوانەکەیان بە کار دەبردرێن. بە هەمان شێوە (یاسای دژەتیرۆر) دەکرێتە (یاسای تیرۆر)، یا (یاسای بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی...)، دەبێتە (یاسای توندوتیژی...)**

یا (لە قـەزای سۆران گـەنجێك خـۆی خنکانـد)، لێـرەدا ڕووداوەکـانی (هاتوچـۆ و تەقینەوە و خۆخنکاندن) لە ناو شارەکانی (کۆیێ و هەڵەبجە و سۆران) ڕوویـان داوە، نـەك لـە ناحیـە و گونـدەکانی دەوروبـەری، بـەڵام بـەپێی ئـەو تەعبیرانـە دیـار نییـە ئـەو ڕووداوانە لە سنووری شارەوانی (کـۆیێ، هەڵەبجـە و سـۆران)دا قـەوماون، یـا لـە سـنووری ئیـدارەی قـەزاکان، ئەمـە وەکـو ئـەوە وایـە بنووسـی (فـۆرمی دامەزراندن لە پارێزگـای هـەولێر دابـەش دەکرێـت)، بـێ گومـان جوێیە لەوەی بنووسیت (فۆرمی دامەزرانـدن لـە شـاری هـەولێر دابەش دەکرێت)[3].

### بە کار بردنی (ە) بۆ مێ

هاوشێوەی عەرەبی هەندێ جار دەبینین بۆ نموونە کاتێ وشەکانی (دکتۆر، ئوستاد، مودیر، وەزیر،...)، بۆ مێیینە بە کار دەهێندرێت، ئەوا دەنووسرێت و دەگوترێت (دکتۆرە، ئوستادە، مودیرە، وەزیرە...).

### هەڵدەستێت بە....

دوای دیار نەمانی گوزارەی (شایانی باسە) لە دەنگوباسی کوردیدا تا ئاستێکی بەرچاو، دەستەواژەی (هەڵدەستێت بە...) پەیدا بوو، ئەگەرچی یەکجار زۆریشی لەسەر نووسراوە، کە دەربڕینێکی هەڵەیە و وەرگێڕانێکی چەوتی زمانی عەرەبییە، بەڵام بە بەردەوامی لە ڕاگەیاندنەکاندا دەبینین، بۆ نموونە دەنووسرێت:

—تیپی هونەری (...) هەڵدەستێت بە سازدانی کۆنسێرتێك.

—یەکێتی (....) هەڵدەستێت بە سازدانی کۆڕێك.

—یانەی (...) هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی یارییەکی دۆستانە...

—کۆمەڵەی (...) هەڵدەستێت بە ڕێکخستنی گردبوونەوەیەك.

—تیمی (...) هەڵدەستێت بە

هەڵمەتێکی...

## لە نێوان هەواڵە وەرزشییەکان و هەواڵەکانی وەرزشدا

هەندێک دەنووسن (هەواڵە وەرزشییەکان)، هەندێکی دی (هەواڵەکانی وەرزش) بە ڕاستتر دەزانن، جارجارە (هەواڵی وەرزشی و دەنگوباسی وەرزشی)ش بە کار دەبردرێت. ئەم کێشەیە تەنیا لە دەنگوباسی وەرزشیدا نییە، لە خوارەوە چەند نموونەیەک دەخەینە ڕوو:

– حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکان/ حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆن.
– سامانە سرووشتییەکان/ سامانەکانی سرووشت.

> لە مانشێتدا دەنووسرێت (تەقینەوەیەک سەد قوربانی لێ کەوتەوە) دوایی لە ناوەڕۆکی هەواڵەکەدا دەنووسرێت (دوو کوژراو و نەوەد و هەشت بریندار لێ کەوتەوە)

– چالاکییە حیزبییەکان/ چالاکییەکانی حیزب.
– گرێبەستە نەوتییەکان/ گرێبەستەکانی نەوت.
– دەزگا ڕاگەیاندنەکان/ دەزگاکانی ڕاگەیاندن.

## وەزیری تەندرووستی پێشوو، یا وەزیری پێشووی تەندرووستی

ڕۆژێک بێژەرێک لە تەلەفزیۆن لەباتی (وەزیری پێشووی تەندرووستی) دەیگوت (وەزیری تەندرووستی پێشوو)، دوایی لە چەند ڕۆژنامە و گۆڤارێکدا دیم (چوارڕیانی تازەی عەنکاوە) بووەتە (چوارڕیانی عەنکاوەی تازە). (گەراجی کۆنی بەغدا)، بووەتە (گەراجی بەغدای کۆن). (فرۆکەخانەی نێودەوڵەتی سلێمانی)، بووەتە (فرۆکەخانەی سلێمانیی نێودەوڵەتی). (خوێندنگەی ئیسلامیی فلان)، بووەتە (خوێندنگەی فلانی ئیسلامی). (دادگای باڵای فیدراڵی) بووەتە (دادگای فیدراڵی باڵا) و هتد...

## کوردنشینی بەغدا یا کوردی بەغدانشین:

(کوردنشینی بەغدا)، یا (کوردنشینانی بەغدا)، ئەوەندەی لێی تێگەیشتبم مەبەست لێی کوردی نیشتەجێی بەغدایە، کە چەند جارێک لە دەزگا ڕاگەیاندنەکانی خۆماندا بەر چاو کەوتوون، بەپێی ئەو زانیارییانەی لە قامووسە کوردییەکانەوە دەیبینین، دەبێ بگوترێت (کوردی بەغدانشین)، وەک چۆن دەگوترێت (شارنشین، دێنشین، دەوارنشین، چادرنشین، ئەورووپانشین و چۆڵنشین....).

## نەقیبی سەندیکا و بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی

من خۆم زێتر لە دە جار دیومە ڕوونکردنەوە دراوە کە دەستەواژەی (نەقیبی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان) هەڵەیە و دەبێ بنووسرێت (نەقیبی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان)[4]، کەچی زۆربەی جار ئەوەی یەکەمیان دەنووسرێت. هەروەها چەندین جاریش خوێندوومەتەوە بۆ نموونە لەبری (بەڕێوەبەری ئاوی هەولێر) دەنووسرێت (بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی ئاوی هەولێر). یا (بەڕێوەبەری گشتی سامانی ئاژەڵ)، دەکرێتە (بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی گشتی سامانی ئاژەڵ). یا (قایماقامی دوکان)، دەکرێتە (قایمقامی قایمقامیەتی قەزای دوکان)، تەنانەت دیومە نووسراوە (بەڕێوەبەرایەتی ڕاگەیاندنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی گەشتوگوزار)! کە ئەمانە ڕێک وەکو ئەوە وایە بڵێی

**ئەگەر ئەو گوزارشتانە درووست بن، دەبێ لە جێگەی (شیعری نووسی، پیاسەیان کرد، خوێندیەوە...)، بنووسرێت (شیعر نووسینی ئەنجام دا، پیاسەکردنیان ساز دا، خوێندنەوەی ڕێک خست،...).**

(وەزیری وەزارەتی پەروەردە)، یا (سەرۆکی سەرۆکایەتی حکومەت)!

## تەنیا و تەنانەت، هەمیشە و هەرگیز

(تەنیا) پێچەوانەی (تەنانەت)ە، (هەمیشە)ش پێچەوانەی (هەرگیز)، کەچی زۆر دەم لە شوێنی مانا پێچەوانەکەیان بە کار دەبردرێن. بە هەمان شێوە (یاسای دژەتیرۆر) دەکرێتە (یاسای تیرۆر)، یا (یاسای بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی...)، دەبێتە (یاسای توندوتیژی...)، هەروەها بۆ وشەی (ڕێزپەر/ شان) دەنووسرێت (نەشان) و بۆ (نیوەچڵ) دەنووسرێت (نانیوەچڵ)، هەر وەک چۆن لە زمانی ئاخاوتنی هەندێ ناوچەدا (عەجوول) دەکرێتە (ناعەجوول)!

## قوربانی لە نێوان کوژراو و برینداردا

لای هەندێک میدیاکار، (قوربانی) هاوواتای (کوژراو)ە، لە کن هەندێکی دیکە (کوژراو و بریندار) دەگرێتەوە، دوور نییە هەندێکی دیکەش هەبن تەنیا بە (بریندار) بێژن (قوربانی)، بە هەر حاڵ ئاڵۆزی و ناڕوونییەکی درووست کردووە، بۆ نموونە لە مانشێتدا دەنووسرێت (تەقینەوەیەک سەد قوربانی لێ کەوتەوە) دوایی لە ناوەڕۆکی هەواڵەکەدا دەنووسرێت (دوو کوژراو و نەوەد و هەشت برینداری لێ کەوتەوە). چەند حاڵەتێکیشم تۆمار کردووە، نووسراوە (قوربانی گیانی/ ئەوەندە قوربانی گیانی لێ کەوتەوە)!

## تێکەڵ کردنی وشەی هاوبێژ

هەموو ئەو وشانەی وێنە و شکڵیان وەکو یەکە و هەر وەکو یەکیش دەخوێندرێنەوە، بەڵام لە واتادا جوداوازن، جوداوازییەکەشیان کاتێک دەردەکەوێت کە دەکەونە نێو رستەوە، لە نموونەی (شیر، بیر، گران، کار...)، هەندێک جار لە لایەن میدیاکارانەوە جۆرێک لە تێکەڵی بەدی دەکرێت، چەند جارێک دیومە لە کاتی بەکارهێنانی پێچەوانەی وشەی (گران)دا، نووسراوە (سووک)، هەر لەو نووسینەدا ئەم جارەیان بووەتە (ئاسان)، یا بووەتە (هەرزان)!

## مانگرتنیان ڕاگەیاند، کۆبوونەوەیان ئەنجام دا...

هەموومان ڕۆژانە لەباتی (مانیان گرت، کۆ بوونەوە، گرد دەبنەوە، دەستی لە کار کێشایەوە، فڵانە شار چۆڵ دەکرێت...)، رستەگەلی (مانگرتنیان ڕاگەیاند، کۆبوونەوەیان ئەنجام دا، گردبوونەوە دەکەن، دەستلەکارکێشانەوەی خۆی ڕاگەیاند، فڵانە شار ناچار بە چۆڵبوون دەکرێت...) دەبینین و دەبیستین، جگە لەوەی ئەم دەستەواژانە لە ڕووی ئیستاتیکییەوە زۆر جوان نایەنە بەر گوێ و چاوان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ئەو گوزارشتانە درووست بن، دەبێ لە جێگەی (شیعری نووسی، پیاسەیان کرد، خوێندیەوە...)، بنووسرێت (شیعر نووسینی ئەنجام دا، پیاسەکردنیان ساز دا، خوێندنەوەی ڕێک خست،...).

## بکەری کۆ و کاری تاك، بکەری تاك و کاری کۆ

ئەم شێوە نووسینانە لە میدیاکانی هەرێمدا یەکجار باون و ڕۆژانە دەبیندرێن و دەخوێندرێنەوە، چەند نموونەیەك دەخەینە ڕوو:

— پۆلیسی سلێمانی کۆنتڕۆڵی ناوچەکە دەکەن.

— کورد ئامادە نییە لە چوارچێوەی عێراقدا بمێننەوە.

— گەڕەکی ئاشتی داوای ئاو دەکەن.

— مامۆستایان داوای دەرماڵەی تایبەت دەکات.

— یەکێتیی مامۆستایان لە سیستمی نوێی موچە ناقایلن.

— کاتی خۆی فەڕەنسا گارودییان سزا دا.

— لەوساوە دایك و باوکیان مردووە.

— وەفدێکی حیزب سەردانی هەولێر دەکەن.

— سەندیکای ڕۆژنامەنووسان بەیاننامەیەکیان دەرکرد.

— تیمی ئاگرکوژێنەوە گەیشتنە شوێنی ڕووداوەکە.

— ڕێکخراوی (فلان) داوای چارەنووسی (فلان) دەکەن.

## کاری داهاتوو خستنە شوێنی کاری ڕابردوو

لەبری ئەوەی بنووسرێت (سەرۆکی حکومەت سەردانی کەرکووکی کرد)، یا (پارێزگاری هەولێر کەمپی پەنابەرانی بەسەر کردەوە)، یا (لایەنە ئۆپۆزسیۆنەکان کۆ بوونەوە)، دەنووسن (سەرۆکی حکومەت سەردانی کەرکووك دەکات)، یا (پارێزگاری هەولێر کەمپی پەنابەران بەسەر دەکاتەوە)، یا (لایەنە ئۆپۆزسیۆنەکان کۆ دەبنەوە)، ئەمە بە بیانووی ئەوەی لە بواری ڕاگەیاندنەوە کاری داهاتووی (دەکات، بەسەر دەکاتەوە، کۆ دەبنەوە) لە کاری ڕانەبردووی (کرد، بەسەر کردەوە، کۆ بوونەوە) گەرم و بەهێز و سەرنجڕاکێشترە، بەڵام لە هەندێك هەواڵدا کە ڕووداوی (تەقینەوە و خنکان و بریندار بوون و کوشتن و دەسگیرکردن)یشی تێدایە، دیسان هەر دەنووسرێت (دەتەقێتەوە، دەخنکێت، بریندار دەبێت، دەکوژرێت، دەسگیر دەکرێت).

### پەراوێز:

1- جگە لە وشەی (قامووس)، زۆرێك (فەرهەنگ) دەنووسن و زۆربەی ئەو کتێبانەی لەو بوارەشدا کاریان کردووە (فەرهەنگ)یان بە کار هێناوە، وەلێ بە هۆی ئەوەی (فەرهەنگ) لە بنجدا فارسییە و زۆر جار لەگەڵ وشەی (ڕۆشنبیری و کلتوور) تێکەڵ دەبێت، بۆیێ (قامووس)مان نووسیوە، ئەگەرچی قامووسیش لە یۆنانییەوە هاتووەتە نێو زمانی عەرەبی و لەوێشەوە پەڕیوەتەوە نێو کوردی. لە بەرانبەر (قامووس و فەرهەنگیش)دا چەندین زاراوەی لە چەشنی (وشەنامە)، (وشەدان)، (گەنجینەی وشە)، (بانکی وشە) و تەنانەت (وشەوانی)ش باس کراون، بەڵام تا ئێستا هیچیان بە تەواوی جێگیر نەبوونە.

2-چەند میدیاکارێك بۆ ناوی شارێکی کوردستان، کە ساڵانێکە لە ڕووی ئیدارییەوە بووەتە قەزا، وشەی (شارۆچکە)یان بە کار بردبوو، ئەو دەربڕینە، قایمقامی نێوەندەکەی توڕە کردبوو و گوتبووی چیدی بۆ ئەو کەناڵانە نادوێم کە بە شارەکەمیان گوتووە شارۆچکە!

3-لە ڕەشنووسی (پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان-عێراق)دا هاتووە: "هەر دێیەك ژمارەی دانیشتوانی لە سێ هەزار کەس کەمتر نەبێ شارەوانییەکی دەبێ"، بەڵام بەپێی زانیاریی ئێمە بە هیچ یاسایەك (شار و شارۆچکە و شارەدێ) دیاری نەکراون، ئەوەی هەیە تەنیا (پارێزگا و قەزا و ناحیە) دیاری کراون.

4- پێم وایە بەشێك لە ڕۆژنامەنووسانی کوردستان بە ئەنقەست (نەقیبی سەندیکا) لەباتی (نەقیبی ڕۆژنامەنووسان) بە کار دێنن، نەك بە هەڵە، بەو حسێبەی، گوایە خاوەنی ئەو پۆستە، سەرۆك یا بەرپرسی یەکەمی ئەو سەندیکایەیە، نەك تێکڕای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان.

# دایە گیان دەی هەڵسەوە.....



هەموو ڕۆژێك بە ترس و لەرزەوە، ڕێگەی قوتابخانەکەی دەگرتە بەر، قەت لەگەڵ قوتابییەکانی دیکە، نەدەگەیشتە دەروازەی پۆلەکەی، ئەم ترس و دڵەڕاوکێیەی وای لێکردبوو، بەردەوام هەنگاوەکانی ڕۆیشتنی ڕۆژانەی بۆ قوتابخانەکەی تەسك ببنەوە، لە ڕێگادا دەیان بیری بۆ دەهات، چەندین بیرۆکەی ترسناکی لە تەمەنی خۆی گەورەتر، بەم تەمەنە کەمەی لە مێشکە بچکۆلەکەی دەخولانەوە، خەمەکانی زۆر لە خۆی گەورەتر بوون تا بتوانێ پەی بە چارەسەرکردنیان ببات، ئەو حەزی دەکرد وەکو قوتابییە زیرەکەکانی دیکەی پۆلەکەی، جل و بەرگ و کتێب و پەڕاوەکانی جوان و پاك بن، ئەو حەزی دەکرد قژی شانە کرابێت و قردێلەیەکی سووری لەسەر قایم کرابێت...

ئەو ئەوەندە لەڕولاواز بوو، کەس باوەڕی نەدەکرد کە پێی نابێتە شەشەمین ساڵی تەمەنییەوە، هێشتا یەکەمین ساڵی لە قوتابخانە بەڕێ نەکردبوو، زۆر جاران بێئەوەی کەس ئاگای لێبێت، دەچووە سەر بانیژەکەیان و خۆی لە پەنای ستارە نزمەکە دەنا و وانەکانی ڕۆژانەی خۆی دەور دەکردنەوە، هەر دوای ئەمیش خۆی بە جوان کردن و ڕێککردنی کتێب و پەڕاوەکانی خەریك دەکرد، پاشان شانە بچکۆلەکەی کە ڕۆژێکیان (نەشمیل)ی دەستەخوشکی تا قژی خۆی پێ شانە بکات بەدیاری پێی دابوو، لە گیرفانی ناوەوەی جانتاکەی دەردەهێنا



**عەلی ساڵح میران**

و بەهێمنی قژی خۆی پێ شانە دەکرد، هەر جارێك کە شانەکەی بەقژە ڕەشەکەیدا دەهێنایە خوارەوە، تۆپەڵێك موو دەکەوتە ناو لەپی، بەڵام هەر دوای ئەمە چەند ساتێکی نەدەبرد، کە خوشك و برا بچکۆلەکانی دیکەی کە لە دایکی خۆی نەبوون، ئەم پەڕاو و کتێب و نووسینە جوانانەی ئەویان

دەشێلا، دەیان دڕاندن و دەیانگەچلاندن، لەبەر باوەژنەکەشی نەیدەوێرا، بەرگری لە خۆی و کەل و پەلەکانی بکات، بۆیە بە داخ و کەسەرەوە لە سووچێکدا دەگریا، ئەو نەیدەزانی ئەم زڕخوشك و برایەی بۆ وادەکەن، بۆ شتی خۆیان نافەوتێنن و هی ئەو وا ناشیرین دەکەن...، لەسەر ئەمەش باوەژنەکەی بەبیانووی ئەوەی لە خۆڕا دەگری تێر لێدانی دەکرد و دوای هاتنەوەی باوکیشی پێش سڵاو و یەکەم قسەی ئەوەبوو، کە(خونە) وانەکانی ناخوێنێ و بە درێژایی ڕۆژ، ئاژاوە لە ماڵەکە دەنێتەوە، خۆی ناوی (خونچە)بوو، بەڵام ئەو بۆ بچووککردنەوەی هەر بە(خونە)بانگی دەکرد، باوکیشی لەسەرخۆ دەیگوت (ژنەکە.... لەگەڵی پشوو درێژ بە و دەستی بەسەردابێنە و بەهەشت بۆخۆت بکڕە....)..، ئەم قسەیە زیاتر باوەژنی تووڕە دەکرد و بە بێزارییەوە دەیگوت (من چیبکەم دایکی جوان پەروەردەی نەکردووە، ئەو سەری دایکی خۆی خواردووە..)...، باوکە بە ماندوو و شەکەتییەوە کە لە بەیانییەوە تا ئێوارە خەریکی سەوزەفرۆشتن بوو، سەیرێکی (خونچە)ی بچکۆلەی دەکرد و لەچاوە ڕەش و بە بریقەکانی دەیان گلەیی و گازاندەی دەخوێندەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە بەر ژنە زماندرێژەکەی جورئەتی ئەوەی نەبوو، لەخۆی بگرێت و ئەوەی لەدڵە بچکۆلەکەی دایە بیخوێنێتەوە..، ئەو حەزی بە شەڕ و ئاژاوەی ناو ماڵ نەدەکرد، هەر کاتێك ژنەکەی قەوانی گلەیی و گازاندەکانی لێدەدا ئەو بێ ئەوەی هێشتا ماندووی حەسابێتەوە ماڵەکەی جێدەهێشت، ئەو کاتەش ناخۆشترین کاتی(خونچە) بوو، چونکە ئەو تەمەنی تەنیا ساڵ و نیوێك بوو کەدایکی بە نەخۆشی هەوکردنی سییەکانی کۆچی دوایی کردبوو، بۆیە ئەو زۆر دڵی بە باوکی دەکرایەوە، ئەو کاتەی ئەو لەماڵ دەبوو، ئەو زەبروزەنگی لەسەر هەڵدەگیرا، باوەژنەکەی لەبەردەم باوکی ڕەفتارێکی دیکەیان لەگەڵی دەکرد کە ئەویش ماوەیەکی کەمی دەخایاند و بە دەرچوونی ئەویش لەماڵ، نەهامەتییەکانی دەستیان پێدەکردەوە..، باوەژنەکەی هەموو کاری ناوماڵی پێدەکرد، ئەو کارانەی کە لە ئاست تەمەنی خۆی زۆر قورس بوون، ئەو کاتانەی کە باوەژنەکەی سەرێکی بازاڕە نزیکەکەی لای خۆیانی دەدا، ئەو دەرفەتی دەورکردنەوەی وانەکانی دەبوو، ئەمەش ماوەیەکی کەم بوو، دەبوا بەپەلە پەڕاو و کتێبەکانی هەڵگرێت و گەسکەکە بە دەستەوە بگرێت...، دەبوا ڕۆژێ چەند جارێك دەست بە کتێبی (ئاین) دابدات و قورئانی بۆ بخوات کە لە کاتی دەرچوونی ئەو لە ماڵ، هەر خەریکی کار و پیشەی ناو ماڵ بووە و دانەنیشتووە، ئەم ڕەفتارانەی ئەو وای لێکردبوو، بۆ بەرگری لە خۆی پەنا بۆ پاساوی نادروست و درۆکردن ببات....

باوکی حەزی دەکرد بخوێنێ، دەیزانی خوێندنەکەی لە دواڕۆژدا بۆ ئەو دەبێتە فریادڕەسێك، هەروەها ئەو چەند کاتژمێرەی لە قوتابخانەیە بۆ ئەو هەڵمژینی هەناسەیەکی روونە و دەرچوونە لەو بارودۆخەی ماڵەوەی و دەرچوونە لە چنگی باوەژنە بێڕەحمەکەی، بەڵام لە بەدبەختی خۆی ئەوەندەش بە قوتابخانەکەی دڵخۆش نەبوو، جارێ هەر کاتێك ناویان بە(خونچە خالید) بخوێندایەوە، زوو زۆربەی قوتابییەکانی پۆل بە زڕخوشکەکەشییەوە، دەیان گوت (مامۆستا... ئەوە ناوی خونچە نییە، لە ماڵەوە پێی دەڵێن خونە)...، تا مامۆستاکەی بێدەنگی دەکردن ئەوان هەر پێدەکەنین....

هیچ ڕۆژێك ئەرکەکانی قوتابخانەی بێ جێبەجێ نەدەکرا..، هەندێ لە مامۆستاکان بێئەوەی لە چۆنییەتی ژیانی ئەو بکۆڵنەوە، لەبەر جێبەجێ نەکردنی ئەرکەکانی و پیس و پۆخڵی.. سەرزەنشتیان دەکرد..، چەند جارێك بە دوای دایکیان نارد کە سەردانی قوتابخانە بکات،

جارێکیان باوەژنەکەی هاتە قوتابخانە و وەکو دایکی (خونچە) خۆی ناساند، دوای وەرگرتنی ڕاسپاردەکانی مامۆستاکان، بەتووڕەییەوە گوتی (چیتر بە دوای مندا مەنێرن و لێیدەن بابخوێنێ و گۆشت بۆ ئێوە و ئێسقانیش بۆ ئێمە..)..

دوای ئەمە چەند جارێکی دیکە مامۆستاکان ڕایان سپارد و گوتیان (خونچە بە دایکە کەمتەرخەمەکەت بڵێ با سەردانمان بکات...).. ئەوەندە ئەم قسەیان پێدەگوت تا بێزاریان کردبوو...، بیری لە زۆر شت دەکردەوە، ڕۆژانە ئەوەندەی دادەما و بیری دەکردەوە، ئەوەندە نەدەدوا، لەم ماوەی دواییەدا نەیدەوێرا بیریش بکاتەوە، هەر جارێك بیری منداڵی بەرەو ئاقاری ئەندێشەکانی ببردایە، باوەژنەکەی لێی دەهاتە دەنگ و دەیگوت (کچێ ...ئەوە داڵغەی چی لێدەدەی، هەی سەرەخۆرە تۆ هێشتا منداڵی....)..

ماوەیەك بوو سەردانی گۆڕی دایکی نەکردبوو، بەم دواییە (خونچە) چەند جارێك داوای لە باوکی کرد، تا سەردانی گۆڕی دایکی بکەن، هەموو جارێکیش بەڵێنی پێدەدا کە ئینشاڵلا ئەو پێنجشەممەیە زیارەتی دەکەن، بەڵام لەبەر ماندوویی و شەکەتی خۆی بەڵێنەکەی نەدەبردە سەر، ڕاستە گۆڕستانەکە لە ماڵەکەیان نەختێ دوور بوو، بەڵام کەوتبووە پشت قوتابخانەکەیان، قوتابخانەکە دوو دەرگای هەبوو، زۆر جاران بۆ ئەوەی نەختێ لە گۆڕی دایکی نزیکتر بێتەوە لەو دەرگایە دەهاتە ژوورەوە کە کەوتبووە بەرامبەر گۆڕستانەکە، ئەو لەبەر بەرزی شوورەی گۆڕستانەکە و کورتە بالایی خۆی قەت گۆڕەکەی نەدەبینی..

ئەو ڕۆژەی مامۆستاکان زۆریان پێگوتبوو کە دەبێ دایکت سەردانمان بکات، ئەو ڕۆژەی کە دەوامیان ئێواران بوو (خونچە) نەگەڕایەوە ماڵەوە...

کاژێرێك مابوو بۆ ڕۆژئاوابوون، باوکی لەسەر کارەکەی گەڕایەوە ماڵەوە، لەبەردەرگا منداڵان هەواڵی نەگەڕانەوەی (خونچە)یان پێدا، بۆ دڵنیابوون لەم هەواڵە ناخۆشە ڕووی کردە (شلێر)ی خێزانی... ئەمیش زۆر بەخەم ساردییەوە گوتی (خەم مەخۆ بۆ کوێ دەچێت؟؟ هەر دەگەڕێتەوە، ماڵی قەلپ سەر بەساحێبیەتی..)...

(خالید) زانی شتێکی ئەوتۆی لە ژنەکەی دەست ناکەوێ، بۆیە ڕایکردە دەرەوەوە، بەرامبەر هاوپۆلەکانی کچەکەی لەسەر ئەژنۆ دانیشت و کەوتە سۆراخی...، دوای بینەو بەردەیەکی زۆر یەکێکیان گوتی (من پێم گوت وەرە با بچینەوە ماڵەوە، ئەو گوتی دەچم سەردانی دایکم دەکەم ...)، ئەم قسەیە هەلۆیستەیەکی پێکرد، دوای تۆزێ بیرکردنەوە، بەرەو گۆڕستانەکە ڕایکرد، تا گەیشتە ئەوێ بە یەك بێن هەر غاری دەدا، کاتێ گەیشتە نزیك گۆڕی (دایکی خونچە)، دنیا خەریك بوو تاریك دادەهات، گوێی لە نوسکەی (خونچە)بوو کە باوەشی بە کێلی گۆڕی دایکی کردبوو و بە گریانەوە دەیگوت (دایەگیان، هەستەوە.. دەی هەستەوە، جوان سەرم بشۆ، جلەکانم بگۆڕە و قژم شانە بکە و قردێلەیەکی سووریشی لێ قایم بکە و بە کاغەزە بریقەدار و ڕەنگاوڕەنگەکانیش کتێبەکانم بەرگ بکەوە و پاشان لەگەڵم وەرە قوتابخانەکەم، لای ئەو مامۆستایەی هەموو ڕۆژێك پێم دەڵێ (با دایکە کەمتەرخەمەکەت سەردانمان بکات)، پێی بڵێ ئەوەتا جل و بەرگ و قژ و کتێبەکانی کچەکەم جوان کردووە، پێی بڵێ من کەمتەرخەم نیم..)، ئەمەی گوت و خەو بردییەوە ..

باوکی گوێی لە هەموو قسە نەرمەکانی بوو و دیمەنەکە ئاگری لە جەرگی بەردا، لەسەرخۆ هەڵی گرتەوە، ماوەیەکی تەواو بەگریانێکی بێدەنگی سەختەوە گرتییە باوەش، پاشان خستییە سەر شانی و تاگەیشتەوە ماڵەوە نەیتوانی لە گریان بوەستێ...

# دیمەنەکانی... ڕەوشی نیشتیمان

بڕوا موحەممەدی

## پسکە پسک



دڵی زۆر توند بوو، کاتێ دیتی دەستەخوشکەکانی، پسکەپسکیان دەکرد. بۆیە بە پەشۆکاوییەوە دەستەکانی بۆ هەردوو لچکی سەرپۆشەکەی برد و شلی دەکردنەوە و توندی دەکردنەوە، لەنکاوەکی[1] لە زریکەی خۆی ڕاچڵەکی، کە لە خۆی هێل بۆوە، لەو خەونەدا، بەبن ئارەقە کەوتبوو، بۆیە کە بیری لە تاڵە مووەکانی بن سەرپۆشەکەی کردەوە. بوێرانە، بڕیاری دا بە هیچ چەشنێك، توخونی هیچ چەشنە پسکەپسکێك نەکەوێت.

(1) لەنکاوەکی: لە ناکاوێکەوە.

## بە، هۆی..

بەهۆی ئەندێشە پڕتۆخەکانیەوە[1]، بە، تالووکەوە[2]، تەکانی دەهاوێشت، تاکو هەوا و نەفسی مەست بکات، وێنای ئەوەش، چنگە خشۆکەکانی بوو، کە شەقامەکانی وڵات، سیماکانی ئەویان، تێدا زەق کرابۆوە. بە وەش[3]، تا دەهات بێزەوەرییەکان، خڕ دەبوونەوە. بێ ئەوەی بیرێ لە حەزە درووستەکان و پێشنیاری خاکی و سەوز بکاتەوە. ئەوەش تووڕەبوونێکی شەقامەکانی بەرامبەر بە خۆی (لڤین)[4] پێکرد بوو، کە لە گین[5] بوو، ئەگەر(نەك) لە خۆی نەکات. خۆی و پڕتۆخییەکانی سەراونخون بین.

(1) پڕتۆخ: نارێك، بێزەوەر　　(2) تالووکە: بەپەلە

(3) بەوەش: بە ئەوەش　　(4) لڤین: جووڵە　　(5) لەگین: نێزیك، خەریك

هرپی لە بری دەرنەدەکرد. چونکە فرپی بە جەماوەرەوە نەبوو. بۆیێ بڕیارە سەپێنراوەکانی، بە زمانی ئەم دیوو ئەو دیو دەکران. ئەوەش وای کردبوو، تا .. دەهات، ڕووخسارەکان گرژتر دەبوون. ئەوەی دەدواش بە زۆری دەیکوشت، نەیدەشاردەوە، ڕەوشی بوارەکانیش، کە لچە لووس و لچە ڕەشکراوەکان، بە تەنناشەوە گاڵتەیان پێدەکرد. بەرەو قۆرخبوون، لە دوای قۆرخبوون.. دەچوون. بێ ئەوەی پەند، لە کەلاکی هاوڕێکانیان، وەرگرن.

دەیانەوێ بە تیلەکان[1]، چاوە جوانەکان سۆر بکەن. تا دڵ و ئاوەزیان[2] بە کوێری و کوێرەوەری سەر بنێنەوە، ئەوەش تاکو بە ئەلهای[3] خۆیان خلیسکانێ بە دونیای ئادەمییە جوانەکان بکەن. بەڵام چاوە جوانەکان، کە مۆگری کۆتاسروشن[4] ئاوەزیان ساخە و دڵیان دەبینێ. بۆیە بە تیلە تیلەیی ئەوان چرووك نابن. هەر بۆیەش ئەوان گەر پەژیوان نەبنەوە، ئەوا بە مەراقەوە بە جۆرێك هەردەدفکێن[5] کە تیتکی[6] خۆیان لە نێو چنگەکانیان دەدیترێ.

(1) بەتیلەکان: بەتیلەی چاوەکان

(2) ئاوەز: عەقڵ

(3) ئەلها: حەزی زۆر و بەتێن

(4) سروش: نیگا

(5) هەردەدفکێن: ئەستووردەبن لە حاڵەتی نائاسایی

(6) تیتك: بەشێك لە پرچ



# بیر کەوە

ئەی ئەوەی تا ئەمڕۆ وێڵ و دووری شەوقی باوەڕی
لەم ژیانە فانیە هەر خولدەر و سەودا سەری
پەیڕەوی گومڕایی تاکەی ڕەوتی بڕوا ناگری
بیرکەوە لەمانگ و ڕۆژ و گۆی زەوی و ئاسمانەکان
چۆن لە بۆشایی لە کاردان کێیە هەلسوڕێنەری
بیرکەوە لە روحی خۆت و بوونەوەر لە گشت جیهان
کێیە غەیری زاتی (الله) پێدەر و لێ وەرگری
بیرکەوە لە کۆچی تالی (ئەنبیا) و (پێغەمبەران)
کوان سەدان سولتان و پاشا و میرو شای وەک قەیسەری
بیرکەوە لە داک و باب و ئازیزانت کێوە چوون
ڕۆژی ناکام نادیارە ها لە ناکاو تێپەڕی
تاکو کەی کات و تەمەن وابێ بەها بەسەر دەبەی
کەی لە گێژەن دەردەچی و کەی هۆشەکەت دێتە بەری
مالی دنیا و پایەداری کەی بۆ کەس تا سەر بووە
چرکەییکە و دڵ دەوەستێ تاکو کەی هەر ملهوڕی
بەسیەتی غەفلەت براکەم تۆبەکە تاکو زووە
ڕەحمەتی (خوا) زۆرە گەر تۆ بیدی تارت لابەری



مەدحەت بێخەو



# پارانەوە

مەحمەت بێخەو

ئەی خودای گەورە و بێ هاوتا دانەری گەردوون و ژین
بێ شەریک و تاک و تەنیا شەوقی ئاسمان و زەمین
ئافەریندەی بوونەوەر تۆی ئەی خودای پەروەردیگار
تۆی بەتەنیا کرد گار و دادوەری داد ڕۆژی (دین)[1]
کێ لە تۆ بەولا بێدار و جاویدان و زیندووە
ئەی بەچرکە ئاگاداری عەرد و ئاسمانی بەرین
چی دیارە و نادیارە خێر و شەر ڕازی دەروون
هەر هەمووی لێت ئاشکرایە وای لەبەندەی ڕێنەبین
ڕووی تکام هەردەم لە ئاسمان و لە دەریای سۆزتە
تا نەمان هاوار دەخیل لە ڕەحمەتت بێبەش نەبین
هەردەمە پارانەوە هەر بوردنە و بەخشینە لێت
پەی بەئیمانم نەبا شەیتانی نەفرین و لەعین
لەم زەمانە نالەبارە بۆ ڕەوتۆ سەختە ڕێم..
هەر دەخیلی نوری ترمە بۆ ڕێگەی تاریک برین
بۆ خەمی باری گوناحمان میهرەبانی تۆ نەبێ
ڕووی سیا لەکوێ بکەین و چۆن لە ئەزموون دەردەچین
چۆن سرووشی وێڵی شیعرم پەی بەباسی تۆ دەبا
من لە دەرگات وێردی زارم هەر تکایە و هەر گرین
گەرچی ڕوو زەردم لە قاپیت نائومێد نیم ئەی خودا
ئایەتی (لاتقنطوا)ت هیوایە بۆ هۆزی (ئەمین)



(1) (دین): حیساب و لێپرسینەوە

# 23 پەیک لە قەصیدەی
# هۆنراوەیەک لە ئاو

1
ئەی ئاو وەرە
جەستەی ناشیرینم ئاویڕژێنکە
ساتێک لەبەردەم
خۆر بامەوەشێنە و
هۆنراوەکانی بارانم فێرکە..

2
جەخار ئەم تینوێتییە
درێژەی کێشا
ئەم تەم و تۆمانە
هەر نەبڕایەوە.

3
خۆر هێشتا میوانە لای هەور
بارانیش دەمامکی شیعری پۆشیوە
لە کلاوڕۆژنە وەستاوە
وەک دڵی من ماتە
بەدوای ڕۆشنتر لەخامۆشیدا
دەگەڕێت.

4
ئاو هێشتا
لە هەوادایە چاوەڕوانی
فەرمانی هەور دەکات
تا میهرەبانێک
بایزەنێ و بۆنی باران
بەزەویدا پەخش بکات.

5
شیعریش هێشتا
لە کۆلانەکانی مەنفاوە
لە تەنیشت دورگەی وەفاوە
هێڵنج دەدا و



کازم جەباری

چاوەڕوانی مەوسیمی بارینە..

6

ئاخ ئەم ڕوحە چەند
تەرە بۆ باران
چەند ماندووە بۆ
پارچە هۆنراوەیەکی کریستاڵی.

7

ئاو تا شیعر تێری نەکات
تینویەتی ناشکێت.

8

شێعر بە ئاو دەژێتەوە و
ڕوح ئاسك دەکاتەوە.

9

دڵ چاوەڕوانی کەرنەڤاڵی
هۆنراوەکانی ئاوە.

10

بولبول شێعردۆست نەبێت
ناتوانێت بۆسروشت بخوێنێت.

11

ئاو هەتا ڕونتربێت
زیاتر لە شێعر دەچێت

12

دەریا هەتا میهرەبانتر بێت
شێعردۆستترە.

13

سەراب
عارەقی شیعرە
بە گۆنای بیابانەوە.

14

چیا قامەتی شیعرە
بە هەناسەی ساردی
پرچی وشەی سپی کردووە.
لە هاویندا..
هەر لە پێڵوی شێعرەوە
فرمێسك دەکات بە ئاو

15

ئاو تا شیعر نەبینێت
جریوە ناکات.

16

خەزان لەناو پێناویدا
گەڵاڕێزان دەکات بە دروشم.

17

شیعر کە بەرگی
پاییزی پۆشی
بۆ ئاو دەگری.

18

باران دەستێکی ئاوە و
دەستەکەی تری با
دەستی میهرەبانی
بەسەر پاییزدا دێنێت
ماڵی ئەو ڕوحە تێر دەکات
کە تینووە بە
هۆنراوەکانی ئاو

19

ئاو و شیعر
دوو دێوانەی یەك خانەقان
نزاکان دەکەن بە سرووت
ئاوازەکانی ژیانەوە
دەڵێنەوە..

20

ئاو و شیعر
شیعر و ئاو
تینویەتی یەکتر دەشکێنن.

21

ئاو و شیعر جاویدانین
لە یەکتردا ڕۆدەچن.

22

ئاو و شیعر
ئەگەر ون بن
مەگەر خۆر بیاندۆزێتەوە.

23

ئاو و شیعر
شەو دەکەن بە ژوانگە و
لە ژێر چەتری ئەستێرەدا..
ماچی تەڕ دەگۆڕنەوە..

# خۆزگەکانم

عادل کەریم

خۆزگەم بە جبریل لە باوەشی گرت
کاتێک لە حیراء پەیامی بۆ برد
خۆزگەم بە زەید و ئیمامی عەلی
لە ژێر دەستی ئەو بیون بەوەلی
خۆزگەم وەک (صدیق) هاودەمت دەبووم
بۆ پارێزگاریت دەهات و دەچووم
خۆزگەم وەک خوبەیب بام بە فیداکار
نەوەک مرگ و دڵ پێت بدا ئازار
خۆزگەم وەک ئەنەس بام بە خزمەتکار
خزمەتکردنی تۆ دەبووە پیشە و کار
خۆزگەم وەک ئەبو سەعیدی خودری
تێر سەیرم دەکرد دەمزانی قەدری
خۆزگەم بە پەوبان عیشقی توی دەرکاند
لەناکاو جبریل پەیامی گەیاند
مژدەی پێ درا تۆ لەگەڵ ئەوی
پەوبان لە خۆشیا سەری کرد ئەوی
خۆزگە وەک سەلمان عەوداڵت دەبووم
لەم شار بۆ ئەم شار دەهات و دەچووم

دەبووم بە بەندە و ڕزگارت کردبام
تا بە ئالوبەیت قەبوڵت کردبام
خۆزگە وەک بیلال ناوت هەمیشە
لەسەر زمانم دەبوو بە پیشە
خۆزگە حەلیمە شیری پێدەدام
تاکو پێغەمبەر بیا بە برام
خۆزگە وەک حەسەن لەئامێزم گرتبای
دەمم دەخستە سەر دەم و گۆنای
خۆزگە وەک ڕۆڵەت حوسەینی جوان ئالو
بەشان و ملتا دەبووم بە ئالو
خۆزگەم بەحاڵی فەزلی کوڕە مام
بە ئامۆژگاری پێی گوتبام غولام
خۆزگە وەک ئەنسار نەک مەڕو ماڵات
پشکی پێغەمبەرم دەبوو بە خەڵات
خۆزگەم خۆزگەکان دەبوون بە پەیام
مژدەی ڕەفاقەتی ئەویان بۆ دێنام
تا لە فیردەوسا بی بە ئاشنام
دڵ ساڕێژ دەبوو و دەروونم ئارام

# دڵۆپێک لە ئەدەبی کوردەواری





کۆکردنەوە و ئامادەکردنی:
تاریق غەفوور مەنتک

1– مەڕ بەپێ ی خۆی، بزنیش بەپێی خۆی.
2– کەرە مەمرە بوهارە، کورتانت بۆ دێ لە شارە.
3– سەگ لە قەسابخانە نەمری، تەمەنی بەفیڕۆ دەچێ.
4– بەرخی نێر بۆ سەربڕین باشە.
5– لێی مەترسە بەرخی نێرە.
6– تێلەك هاتووە لە ڕواندزێ، ژنی بخوازێ بە مامزێ.
7– ئەمن دەڵێم نێرە ئەو دەرێ بیدۆشە.
8– وەلی عاقڵم بیستووە، وەلی شێتم نەبیستووە.
9– سەگی خۆت بە شێری کەس مەدە.
10– روحم دەربێنە، پارە لەبەرکم دەرمەهێنە.
11– برسیەتی ڕەگێکی لەهارییە.
12– لە جێی شێران، ڕێوی دەکاتە گێرە.
13– چاوەڕێی خواردن بە کوشتنێك زیاترە.
14– شەر بەچەك، مامڵە بە دراو.
15– کە جام پڕبوو لێی دەڕژێ.
16– ئەوەی زۆر بلێ، خراپیش دەڵێ.
17– ئەگەر بەباشی نادوێی، بەخراپیش هەر مەدوێ.
18– کەر دەڵێت تاکو کەی بزەڕم.
19– تۆ ئاغا من ئاغا، کێ بەڕەمان بۆ ڕاخا.
20– ڕێوییەکی گەڕۆك لە شێرەکی نوستوو باشترە.
21– ڕێوی دەڵێت ئەگەر مردم لە کۆڕیتی مریشکان بمشارنەوە.
22– دینی محەممەدی بەئاشکرا خۆشە.
23– سەگ زۆر وەڕی، بزانە ئەوە تۆڕییە.
24– دایك مردوو دەنوێ، سك برسی نانوێ.

**تێبینی:**
بۆ سوود وەرگرتن و کۆکردنەوەی ئەم پەندە و گوتە ڕاستەقینانە سوودم وەرگرتووە لە:
1– محەمەد شەریف ئەحمەد، کە لە دەشتی هەولێر دایك بووە و خوێندنی لە بەغدا تەواو کردووە.
2– ئامینە شەریف ئەحمەد – خەڵکی هەولێرە، نەخوێندەوارە، لە تەمەنی سەد ساڵی لەمانگی تەمموزی 2012 کۆچی دوای کردووە.



# گەلەری کتێب

## هۆکارەکانی سەرکەوتنی ڕەوتی ئیسلامی میانڕەو

(هۆکارەکانی سەرکەوتنی ڕەوتی ئیسلامی میانڕەو) کتێبێکە لە (86) لاپەڕە پێکدێت و لە لایەن ( عومەر عبدولعەزین)ەوە نووسراوە.

نووسەر لەم کتێبەدا، باس لە فاکتەر و هۆکارە زاتییەکانی سەرکەوتنی ڕەوتی ئیسلامی میانڕەو دەکات، کە بە گوتەی نووسەر لە ئێستادا لە زیاتر لە هەشتا وڵاتی دونیادا ئەم ڕەوتە بوون و چالاکیی هەیە.

هەروەها نووسەر پێی وایە ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندییانەی لە سەرەتای دەرکەوتنیەوە لە ڕەوتی ئیسلامی میانڕەودا هەیە، پێی ناسراوە و بووەتە شوناسی و پێناس بۆی، لەگەڵ ئەوەش ( عومەر عەبدولعەزین) نووسەری کتێبی (هۆکارەکانی سەرکەوتنی ڕەوتی ئیسلامی میانڕەو) بۆچوونی وایە کە دەبێت ئەو ڕەوتە خۆی لە هەندێك فۆرمی کلاسیکی و شێوازی بەسەرچوو دوور بخاتەوە و گەشەی زیاتر بە بیرکردنەوەیان بدەن.




## واتا سازی، وشە و ڕستە

(واتا سازی، وشە و ڕستە) کتێبێکی (200) لاپەڕەییە، (د. عەبدولواحید موشیر دزەیی) نووسیویەتی، ئەم کتێبە لەشەش بەشی سەرەکی پێکدێت کە بریتین لە (چەمك و بنەمای واتا)، (بۆچوونەکانی لێکدانەوەی واتا)، (جۆرەکانی واتا)، (واتاسازی وشە)، (واتاسازی ڕستە) و (گەشە و گۆڕانی واتا).

نووسەر لەم کتێبەدا بایەخی واتاسازی و پەیوەندیی لەگەڵ تیۆر و زانستەکانی دیکەی زماندا دەخاتە ڕوو، باوەڕی خۆشی وا دەربڕیوە کە واتاسازی زانستێکی تازەیە لە چاو زانستە زمانییەکانی دیکەدا.

کتێبی (واتا سازی، وشە و ڕستە) هەوڵ دەدات بۆ زانستی واتاسازی و ڕوونکردنەوەی... بە پشت بەستن بە ژمارەیەك سەرچاوەی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی.





## مرۆڤی نیادرتاڵ

(مرۆڤی نیادرتاڵ، لەنێوان هەبوونی و نەبوونی فیزیکیدا، خوێندنەوەیەك بۆ تەمەنی عائیشە و بیری د. سروش و قەبانچی)، لە نووسینی (سەلام ناوخۆش) لە دوو تویی (112) لاپەڕەدا و لە سێ تەوەری سەرەکی پێکهاتووە.

لەتەوەری یەکەمدا، نووسەر باس لە باوکە ئادەم دەکات لەنێوان مرۆڤبوون و پێغەمبەربووندا، هەروەك پرسیاری ئەوە دەوروژێنی ئاخۆ ئەو بەهەشتەی ئادەمی لێ بووە، بەهەشتی ڕاستەقینە بووە یا باخێك بووە لە باخەکانی زەوی.

لەتەوەری دووەمدا کە لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی (م. سەلام) باس لەکاتی شووکردنی تەمەنی حەزرەتی (عائیشە) دەکات کە ئاخۆ (شەش ساڵان) بووە یاخود (نۆساڵان) یا (هەژدە ساڵان)...

تەوەری سێیەمی کتێبەکە لە هزری (عەبدولکەریم سروش) دەدوێ و ڕادەی کاریگەری و ئامادەگی لەسەر سیکولەری کوردی و میدیای کوردیدا پیشان دەدا.




## مێژووی شێوێنراومان

(مێژووی شێوێنراومان) لەنووسینی (د. یوسف قەرەزاوی)یە، (ئیکرام کەریم) لە عەرەبییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و (ڕێناس ئەحمەد) پێیدا چووەتەوە، کتێبەکە لە (488) لاپەڕە پێکهاتووە.

ئەم کتێبە بە شێوەیەکی کورت باسی مێژووی سەردەمی ڕاشدین و ئەمەوی و عەبباسی دەکات و جگە لە ڕەواندنەوەی گومانی ژمارەیەك نووسەرکە کە لایەنە نەرێنیەکانی ئەم مێژووە زەق دەکەنەوە و زیادەڕەوی تێدا دەکەن، هەروەها ڕەخنە لە بیر و بۆچوون و دیدی ژمارەیەك بیرمەند و زانای ئیسلامیش دەگرێ کە لە زۆر شوێندا ناهەقییان بەرامبەر ئەو سێ سەردەمەی مێژووی ئیسلامی کردووە، بەگوێرەی باوەڕی نووسەری کتێبەکە.



## گۆڤاری k21

گۆڤاری k21 گۆڤارێکی کەلتوری و زانستی و مێژووی و بەڵگەنامەیی و نەتەوەییە...

ژمارە 17 لە 22 نیسانی ئەمساڵدا کەوتە بەردیدەی خوێنەرانی، لەم بەرواره کە یادی (115ساڵە)ی راپەرینی قەڵەمی رەسەنی کوردە...

گۆڤاری K21 لەم ژمارەیشیدا وەکو هەموو ژمارەکانی دیکە چەندین بابەتی بەڵگەنامەیی و مێژوویی و کەلتوریی لە خۆگرتووە، تیشکی خستووەتە سەر کۆمەڵە بابەتێکی (ساڵح حەیدەری) سیاسەتمەدار کە بۆ یەکەمین جارە بڵاودەکرێنەوە و هەر لە لاپەڕە (29)ی گۆڤارەکە تا لاپەرە (363) هەمووی بەدەست خەتی خۆی لەزەمان و رەوشێکی سیاسی ئاڵۆز و تایبەت نووسراوەتەوە، تێیدا باس لە پەیوەندییە نەتەوەییەکان و مەسەلەی کورد لە حەفتاکان دەکات، باس لە مێژوویەکی ئاڵۆز و پڕ لە کێشەی کوردانی عێراق دەکات لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەند و بەنەوەی ئەمڕۆی نەتەوەکەمانی دەناسێنێ.

ئەمە جگە لە بارودۆخی ئەوسای کورد لە رووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووریەوە بە پەیوەندی کورد لەگەڵ نەتەوەکانی دیکە، هەروەها گۆڤارەکە جگە لەمەش چەندین باسی دیکەی بەزمانی کوردی و عەرەبی لەخۆ گرتووە.... خودانی دەرکردنی گۆڤاری K21 ، ( زیلان حەیدەری) و سەرنووسەرەکەیشی (مومتاز حەیدەری)یە.




## رەنگدانەوەی کە لە پوور لە رۆمانی کوردیدا

(رەنگدانەوەی کەلەپوور لە رۆمانی کوردیدا) کتێبێکی (248) لاپەرەییە و (د. ئیبراهیم حەسەن) نووسیویەتی. بەشی یەکەمی ئەم کتێبە تایبەت کراوە بە لایەنی تیۆری فۆلکلۆر و کەلەپووری میللی. لە بەشی دووەمی کتێبەکەدا نووسەر قسە لە رەنگدانەوەی کەلەپوور لە رۆمانی کوردیدا دەکات و چەند نووسەر و رۆمانێك بە نموونە باس کراون.

بەشی سێیەمی کتێبەکەش لەدوو تەوەری سەرەکیدا باس لە رەنگدانەوەی هونەرەکانی کەلەپووری میللی و رەنگدانەوەی کەلەپووری ناوچەیی لە رۆمانی کوردیدا کراوە.

لەم کتێبەدا وەك نووسەر دەڵێت بە رێبازی تیۆری و شیکاری و پراکتیکی لە دەستنیشان کردنی کەلەپوور لە رۆمانەکاندا باسی کراون.





# سۆراخ



"لە مەهوی دڵ لەکەر ون بوو وەکوو کەنج
سۆراغی کەن لە کونجی کۆنە دەیران"
مەهوی

ئەی ئەوەی سۆراخم دەکەی
لە ناونیشانم دەگەڕێی
دەئەوێ ناسنامەم بیشکێنی من لێرەم
لە کوخە دڵگیرەکەی خۆمدا
خۆم و ڕۆحێکی خوێن تێزاوێر لە
بڕین دڵێکی خاکی و دنیایەک لە
ئەوین
خۆم و ناخچەیەک لێوانلێو لە
گوڵاڵەی یەیفی شێرین
خۆم و خامەیەک لێوڕێژ لە غەزەلی
نەی و لە مۆسیقای ژینی ئەوە گیرفانی
بچووکی منە
سێخناخە لە نوقڵی وشە
ئەوە کەپری دڵی منە
سەرشار لە شەونمی شیعر
ئەوە ماڵی ڕۆحی منە

کەپلی دیوانی گوڵڕەنگ و بەیتی ئاوداری
ئاوەدان
یا خچەکەی من پڕە لە چڵەداری خەیاڵ و
کەوی دەنگخۆشی هۆنراوە
من لێرە
شەو لەنێو یەیفە بەژن زراڤەکانی ئاڵی و
هەڵبەستە ئەرویرەکانی حاجی دەنووم
لە ناو دێڕی قەسیدە عیرفانییەکانی
مەحوی و جامە جاو جوانەکانی گۆراندا
ڕۆژ دەکەمەوە
بۆیێ زانین
کێ تلێپنیی زمانم
ئەکاک و زیرەکی گەرەکە
ئە ماندووەک دەکا
ئەی ئەوەی سۆراخم دەکەی

زیاد ڕەشاد قادر
هاوینی ٢٠١٠